

# دروستی بەکارهێنانی وشەی
# ( خــــودا ) لەجیاتی وشەی ( اللّٰه )
# لە ئاخاوتن و نووسین و ئامۆژگاری و پەرستشەکاندا

توێژینەوەیەکی بەڵگەداری فیقهی بەراوردکارییە


نووسینی:

پ.د.حسن خالد مصطفى محمود موفتی



کوردستان

1444ك – 2023ز







# دروستی بەکارهێنانی ووشەی(خودا)

# لە جیاتی ووشەی (اللّٰه)

# لە ئاخاوتن و نوسین و ئامۆژگاری و پەرسشتەکاندا

## ـ توێژینەوەیەکی بەڵگەداری فیقهی بەراووردکارییە ـ


نوسینی:

**پ. د. حسن خالد مصطفى محمود موفتی**

پرۆفیسۆر لە زانکۆی سەلاحەددین، سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای فەتوا لە کوردستان



کوردستان

1444ك = 2023 ز







لە بڵاوکراوەکانی

یەکێتی زانایانی ئاییـنی ئیسلامی کوردستان

**ناوی کتێب:** دروستی بەکارهێنانی ووشەی(خودا) لە جیاتی ووشەی (اللّٰه)

لە ئاخاوتن و نوسین و ئامۆژگاری و پەرستشتەکاندا۔ توێژینەوەیەکی بەڵگەداری فیقهی بەراووردکارییە ۔

**دانەر:** پرۆفیسۆر دکتۆر **حسن خالد مصطفى محمود** موفتی

**لە بڵاوکراوەکانی:** یەکێتی زانایانی ئاییـنی ئیسلامی لە کوردستان (مەکتەبی راگەیاندن)

**چاپی:** ( یەکەم).

**چاپخانەی:** رۆژهەڵات

**ساڵی بلاوکردنەوە:** 1444هـ ـ 2023ز

**دیزاین:** ئەحمەد هەرتەلی

**بەرگ:** مەلا عبداللە شێرکاوەیی

**ژمارەی سپاردن:** لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتیەکان/ هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (391) ساڵی 2023 پێدراوە.






**خودای میهرەبان دەفەرموێت:**

**{ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرا وَنَذِيراۚ وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِير }**

**(سُورة فَاطر: ٢)**

**{وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيم}**

**(سورة إِبراهيم: ٤)**







(بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان)

**الحمدلله والصلاة والسلام على سيدنا رسول الله شفيعنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين:**

## پێشەکی:

لەم دووایییانەدا لێرەو لەوێ بە داخەوە خەریکە وەهمێک پەیدا دەبێت، خەڵکێکی سەر مینبەریش بە نەزانین و تەقلیدکرنی کوێرانە شوێنی ئەو وەهمە دەکەون و شوبهەیەکیان لێ بووە بە راستی کە گوایە دروست نییە بەکارهێنانی زاراوەی (خودا) لە زمانی کوردیدا لە بری واتای زاراوەی (الله) لە زمانی عەرەبیدا، یان وەرگێڕانی (صفات) و ناوە جوانەکانی خودا بۆ زمانی جگە لە عەرەبی، کە لە راستیدا ئەمە هیچ بنەمایەکی شەرعی و عەقڵی و زمانەوانی نییەو هیچ کێشەیەکی شەرعی و عەقائیدی و عورفی و عەقڵی و زمانەوانی لەوەدا نییە کە گوتاربێژ یان نوسەر یان هەر خەڵکێکی ئاسایی بە نمونە لە جیاتی ئەوەی بڵێت: (الله)، بڵێت: (خودا)، یان لە بری ئەوەی بڵێ: (الرحمن)، بڵێت: (بەخشندە)و لە بری (الرحیم) بڵێ: (دلۆڤان) یان (بە بەزەیی) یان (میهرەبان)یان هەر واتایەکی لەو چەشنەو بە هەرزمانێکی تر. چونکە کێشەیەک نییە دوو دەربڕین ـ تەنانەت لە یەک زمانیشدا ـ بۆ یەک مەبەست و یەک واتا بەکار بێت کە بە هاو واتا ناوزەند دەکرێت.





بۆیە حەزم کرد توێژینەوەیەکی وورد و دروست لەو رووە ئەنجام بدەم و ئەو راستیە بخەمە ڕوو، تا دروستی ئەو تێنەگەشتنە بسەلمێنم بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و رای زانایانی بەرزی ئیسلام، بە تەوفیق و یارمەتی خودای پەروەردگارم، هەروەها جێگەی باسە کە ئەم توێژینەوەیە جگە لەوانەی کە رابوورد چەندین چەمکی پەیوەستدار بەو بابەتانەوە لە خۆ دەگرێت، هەمویشی بە شێوازی فیقهی بەراوردکاری پاڵپشتن بە بەڵگەکانی قورئان و سوننەت و دەقە شەرعییەکان، بە ناوی: (دروستی بەکارهێنانی ووشەی (خودا) لەجیاتی ووشەی (الله) لە ئاخاوتن و نوسین و ئامۆژگاری و پەرسشەکان ـ توێژینەوەیەکی بەڵگەداری فیقهی بەراووردکارییە -) بەو هیوایەی کە سودبەخشبن بۆ موسڵمانان بە گشتی و موسڵمانانی کورد و تێکڕای نەتەوە غەیرە عەرەبەکان بە تایبەتی، والله الموفق للصواب، وصلى الله على سيدنا محمد وآله وصحبه وسلم أجمعين.

نوسەر

هەولێر- کوردستان

1/2/ ٢٠٢٣ز





# (درێژەی توێژینەوەکە)

خوای میهرەبان دەفەرموێت:{ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ}[1] واتە: بانگی خودا (الله) بکەن و بیپەرستن، یان بانگی رەحمان بکەن و بیپەرستن، هەرکامێکیان بانگ بپەرستن و بپاڕێنەوە لێی تەنها بۆ ئەوەو شایستەی ئەوە ناوە جوانەکان.

بەڵام قورئان نەیفەرمووە: تەنها بە زمانی عەرەبی بانگی خودا بکەن و بیپەرستن، بۆیە ئەمە هەرگیز بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی تۆی موسڵمانی کورد ئیدی نەتوانیت بانگ و عیبادەت و ستایشی پەروەردگارت بکەیت (جل جلاله) بە جگە لە زمانی عەرەبی یان بانگی خودا نەتوانیت بکەیت جگە بە لەفزی جەلالە (الله) یان سیفەت و ناوەکانی تری کە بە زمانی عەرەبی لە قورئاندا هاتووە..

بەڵێ؛ ئەگەر گوترا بە کەسێکی غەیرە عەرەب: (الله) بپەرستە. ئەویش ئەگەر تازە موسڵمان بووبێت دەڵێی (الله) کێیە و پێم بناسێنە.

تۆیش پێویستەو واجبەو مەجبووری لە وڵامدا بڵێی پێی: (الله) واتە: ( خودا) ی تاقانە کە تەنها پەرستراوی هەقەو دروستکار و پەروەردگاری هەموو بونەوەرە.

---

(1) (سورة الإسراء:١١٠).





ئیتر پاش ئەو پێناسەیە هەرکات گوترا (الله)دەزانرێت مەبەست لێی (خودا) یە، (جل جلاله)، بە پێچەوانەیشەوە هەرکات گوترا (خودا) دەزانرێت مەبەست لێی (الله) یە (جل شأنه)، جیاوازییان تەنها گۆڕینی زمانەو دەربڕینە هیچی تر، ئەویان بە عەرەبی و ئەمیان بە کوردی، چونکە مەفهوم و واتاو ماناو مەبەست لە هەردووکیان تەنها زاتی حەق تەعالایە.

بۆیە دروستە ووشەی ناسراوی خودا بەکاربهێنرێت بۆ هەموو جۆرە عیبادەتێک و هەموو جۆرە زیکرێک و هەموو جۆرە مامەڵەیەکی شەرعی لە تێکڕای دەرگاکانی شەریعەتدا، تەنانەت لە بانگ و قامەتیشدا بۆ هەندێ حاڵەت دروستەو لە خودی نوێژیشدا بۆ هەندێ کەس و بە پێی رای هەندێک لە مەزاهیبی ئەهلی سوننەت دروستە، تەنانەت بۆ کەسێک سورەتی فاتیحەی نەزانێت لای پێشەوا ئەبو حەنیفە دروستە واتاکەی بە زمانی فارسی یان کوردی بخوێنێت تەنانەت لە نوێژیشدا، تا فێر دەبێت، قەولێکی تری هەیە دەفەرموێت پاش فێربوونیشی هەر دروستە.

بەڵام ئەم قەولە ئەخیرەی نەبوەتە فەتوا لەو مەزهەبەکەیدا و فەتوای جمهوری زانایان دروسترە کە کەسێک نەیتوانی سورەتی فاتیحە بخوێنێت پێویستە بە ئەندازەی ئەو زیکری خودا بکات هەتا فێر دەبێت، جا بە عەرەبی زانی واجبە بە عەرەبی بێت، ئەگەرنا، جگە لە فاتیحە دروستە هەموو ویردو زیکرو تەسبیحات و تەحییات و شەهادەت و سڵاوات و (الله اكبر) ی نوێژدابەستن و سەلام دانەوەی






نوێژەکانی بە کوردی یان هەر زمانێکی تر ئەنجامی بدات، تا ئەوکاتە ی فێریان دەبێت، وەک بە درێژی دێینە سەر بەڵگەو دەقەکانی زانایانی ئیسلام لەو رووەوە..

هەروەها بە کۆی دەنگ دروستە لە مامەڵەو سوێند خواردن و تەڵاقدان و شایەتومان و ویردو زیکری دەرەوەی نوێژەکان ـ تەنانەت نیکاحیش لەلای حەنەفیەکان و لای پێشەوا غەزالی و غەیری ئەویش لە شافیعیەکان ـ دروستە بە کوردی بییان ڵێت، وە لە جیاتی ناوی (الله) بڵێی (خودا).

خوێنەری بەڕێز:

وەک چۆن ووشەی (الله) لە عەرەبیدا عەلەمەو دیار و ناسراوە بۆ زاتی پەروەردگاری پەرستراوی بە حەق، هەروایش ووشەی (خودا) عەلەم و دیارو ناسراوە بۆ هەمان زاتی حەق (جل جلالە).

تەنانەت ئەگەر زاتی (الله) تەنها بە (ضمیر) ی (هُ) یان (هُوَ) یان (انت) یش لە دەستەواژەی عەرەبیدا بەکاری بهێنرێت و ئاماژەیان پێ بکرێت بۆ (الله)هەر دروستەو مەبەست هەر خودایە.

بۆیە لە قورئاندا لە چەندین جێگەدا لە جیاتی لەفزی (الله) تەنها (ضمیر) ێک یان (ضمیر الشأن) یان (غائب) یان تەنانەت ضمیری شاراوە بەکارهاتووە بۆ خودا، وەک ئایەتەکانی :





1ـ سورەتی ئیخلاس کە هەموی تێدایە: { **قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ * ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ * لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ * وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ**} [2]

٢- ضمير ی (انت) و (ك) ی (خطاب) وەک لە ئایەتی: { **فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ** } [3]

هەروەها ووشەی (الذي) کە ئیسمی (موصول) ە، لە زۆر جێگەدا لە جیاتی لەفزی جەلالە (الله) بەکارهاتووە لە قورئاندا وەک: { **وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ..**}[4]، { **وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۖ..** }[5]

هەروەها خودا لە قورئاندا لە جیاتی ناوی خۆی ببات بە (ضمیر)ی (أنا) یان بە (نحن)یان (إنَّا) یان (نا) بۆ تەعظیمی زاتی پاکی بۆ خۆی بەکاری هێناوە وەک:

1ـ قوله تعالى: { **أَهُمۡ يَقۡسِمُونَ رَحۡمَتَ رَبِّكَۚ نَحۡنُ قَسَمۡنَا بَيۡنَهُم مَّعِيشَتَهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَرَفَعۡنَا بَعۡضَهُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ..** }[6]

2- قوله تعالى: { **إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ * وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي شِيَعِ ٱلۡأَوَّلِينَ**}[7]

---

(2) (سورةُ الإخلاص: ١-٤).

(3) (سورة الأنبياء: ٨٧).

(4) (سورة الأنعام من الآية: ٦٠).

(5) (سورة الأنعامِ: ٧٣).

(6) (سورة الزخرف من الآية: ٣٢).

(7) (سورة الحِجر: ٩-١٠).





هەروەها لە جیاتی ووشەی (الله) ووشەی (رب) لە قورئاندا بەکارهاتووەو بە هۆی (مضاف اليه)کەی بۆ ووشەیەکی تری وەک: (رب العالمين، رب السماوات رب الأرضين، رب العرش ، رب الملائكة ، رب الفلق، رب الناس،) یان بۆ (ضمير)ێکی وەک: (ياء ، نا، كم، ك، كما) وە وەک (ربي ، ربنا ، ربكم، ربك، ربكما، ربه، ربهم..)، دەرکەوتووە کە مەبەست لەوانە پەروەردگارە (جل جلاله) کە هەموو ئەوانەیش لە چەندین ئایەتدا هاتوون.

هەروەها لە جیاتی (الله)ووشەی (إلاه) هاتووە بە ئیزافە بۆ لای ووشەیەک یان زەمیرێکی تر کە بەهۆیەوە دەردەکەوێت کە مەبەست لێی زاتی حەق تەعالایە، وەک (إله الناس)، (إله آبائك)، (إلهك، إلهنا، إلهكم..).

چەندین شێوازی تریش، کە لە قورئاندا بەکارهاتووەو لە بەر شێوازی ئاخاوتنی زمانی عەرەبی وەک دەفەرموێت: **{ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ}**[8] **{ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَٰهُ حُكۡمًا عَرَبِيّاۚ.. }**[9] **{ قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا غَيۡرَ ذِي عِوَج لَّعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ }**[10]

بۆیە لە جییاتی ووشەی (الله) قورئان (إلَه) ی بەکارهێناوەو بە زەمیری شەئنیش (هو) بۆی گێڕاوەتەوە، وەک دەفەرموێت: **{ وَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰه وَاحِد لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا**

(8) (سُورةُ يوسف: ٢).

(9) (سُورة الرّعد من سورة: ٣٧).

(10) (سورة الزُّمر: ٢٨).





**هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ }**[11]، **{ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ...وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ}**[12]، **{ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ }**[13]، **{ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ..}** [14]

لەبەر ئەم بەکارهێنانەی قورئانە بۆ لەفزی (هو) کە تەعبیرە لە زاتی خودا، زانایان دەفەرموون زیکری (یا هو) لە باشترین زیکرەکانی خودایە، لەو رووەیشەوە پێشەوا ئیمام (فخرالدین)ی رازی چەندین نهێنی و سودی ئیمانی لەو زیکرەدا لە ژێر بەشی (الفصل التاسع في الأسماء الحاصلة لله تعالى من باب الأسماء المضمرة) لە ژێر ناونیشانی:" أسرار من التصوف في لفظ «هو»دا دەفەرموێت: "واعلم أن لفظ «هو» فيه أسرار عجيبة وأحوال عالية، فبعضها يمكن شرحه وتقريره وبيانه، وبعضها لا يمكن، قال مصنف الكتاب: وأنا بتوفيق الله كتبت أسرارا لطيفة، إلا أني كلما أقابل تلك الكلمات المكتوبة بما أجده في القلب من البهجة والسعادة عند ذكر كلمة «هو» أجد المكتوب بالنسبة إلى تلك الأحوال المشاهدة حقيرا، فعند هذا

(11) (سورة البقرة: ١٦٣).

(12) (سورة البقرةِ: ٢٥٥).

(13) (سورة آل عِمران: ١٨).

(14) (سورة النّساء من الآية: ٨٧).







عرفت أن لهذه الكلمة تأثيرا عجيبا في القلب لا يصل البيان إليه، ولا ينتهي الشرح إليه، فلنكتب ما يمكن ذكره فنقول: فيه أسرار..الخ"[15].

رەنگە بگوترێت ووشەی عەلەم ناکرێت وەرگێڕانی بۆ بکرێت، لە وەڵامدا دەڵێین:

بەڵێ زاراوەی الله عەلەمە، بەڵام واتای عەلەمەکە چییە؟ هەروەها لە زاراوەی عەرەبدا واتاکەی چییە؟ چونکە زارەوەیەکی عەرەبییەو پێویستە گەلانی تری جیهان واتاکەی بزانن چونکە ئیسلام بۆ هەموانە, نەک تەنها بۆ عەرەب.

کە کەسێکی کورد دەڵێت: واتای (بسم الله الرحمن الرحيم) چییە؟ خۆ نابێت بڵێیت واتە: (بە ناوی اللەی الرحمانی الرحيم)! جا ئەگەر وات گوت، چیت مانا کرد؟

کەسەکە ئەڵێت: یانی چی (الله) مەبەست لە (الرحمن و الرحيم) کێیەو چییە؟

مەجبوری بڵێیت: الله خودایە و (الرحمن) یس سیفەتی ئەوەو بە واتای بەخشندەیە، و (الرحيم) یش واتە دڵۆڤان و میهرەبان.

ئەگەر زیاتریشی پێویست بوو، پێویستە بە درێژی تەفسیری بەسمەلەی بۆ بکەیت، وەک تەفسیری زانیان کە هەندێکیان بە سەد لاپەڕە تەفسیریان کردووە.

---

(15) مفاتيح الغيب أو التفسير الكبير للفخر الرازي: (1/ 135).







بۆ ئەوەی کە لە قورئاندا یان لە نوێژدا یان لە ئاخاوتنی خۆیدا بە نمونە بسم اللەی کرد بزانێت واتاکەی چییە،

بـا ئەو ووشـەیە عەلەمـیش بێـت بەڵام کەس نەیگوتـووەو هـیچ دەلیلێـک نـیە بـاس لەوە بکـات کە نابێـت واتـاکەی وەربگێـڕدرێتە زمـانی غەیـری عەرەبـی، بە پـێچەوانەوە ئـایەتی: **{ كِتَـٰبٌ أُنـزِلَ إِلَيۡـكَ فَلَا يَكُن فِـى صَدۡرِكَ حَرَج مِّنۡـهُ لِتُنـذِرَ بِـهِۦ وَذِكۡـرَىٰ لِلۡمُـؤۡمِنِينَ }**[16] مەعلـومە پێویسـتە بە قورئـان رونبکـرێتەوە و تەفسـیر و بەیـان بکرێـت بە ئـایەتی: **{ وَأَنزَلۡنَـآ إِلَيۡـكَ ٱلـذِّكۡرَ لِتُبَـيِّنَ لِلنَّـاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ}**[17]

بەشـێکیش لە قورئـان (أسـماء و صـفات)ی خـودا ن، (جـل جلالـه)، کەواتە ئەوانـیش پێویسـتە روون بکـرێنەوەو وەربگێـڕدرێنە سـەر زمانەکـانی تـر، تـا ئینـذارەکە بەرجەسـتە ببێـت، بە تـایبەت بـۆ غەیـری عەرەب واتە میللەتـانی عەجەم، چـونکە قورئـان هەر بـۆ عەرەب نەهـاتووە، بەڵکـو بـۆ هەمـوو جیهانیـانە، لەو بەڵگانەش کە لە وەصفی قورئاندا هاتووە:

---

(16) (سورة الأعراف: ٢).

(17) (سورة النَّحل: ٤٤).






قوله تعالی: **{وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ}** [18] و قوله تعالی: **{لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ}**[19] وقوله تعالی: **{تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ لِيَكُونَ لِلۡعَٰلَمِينَ نَذِيرًا}**[20]

ئەگەر دەڵێت: قورئان دەفەرموێت ئینزار هەر بۆ مەککەو چواردەوریەتی بەئایەتی: **{وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَك مُّصَدِّقُ ٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ وَمَنۡ حَوۡلَهَاۚ }**[21] ئەوانیش عەرەب بوون!

**دەڵێین :**

**یەکەم:** (ومن حولها) هەموو دونیا دەگرێتەوە نزیک و دوور.

**دووەم:** ئەگەر هەر کەس پێی وابێت تەنها مەککەو چواردەوری لە جزیرەی عەرەبی دەگرێتەوە ئەوە پێی کافر دەبێت، بەو ئایەتانەی کە پێشتر باسمانکرد، کە قورئان بۆ هەموو مرۆڤ و جنۆکەیشە تا رۆژی قیامەت.

**سێیەم:** مەبەست لەو ئایەتەو ئایەتەکەی تری سورەتی شوری: **{وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ قُرۡءَانًا عَرَبِيّا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ وَمن حولها }**[22] تەدریجە لە تەبلیغدا، واتە سەرەتا ئەوان و پاشتر هەموو عەرەب و عەجەم و

---

(18) (سورة الأعراف: ٢).

(19) (سورة النَّحل: ٤٤).

(20) (سورة الفُرقان: ١).

(21) (سورة الأنعام من الآية: ٩٢).

(22) (سورة الشُّورى: ٧).






رۆم و فارس..هتد. ئەوەیش کۆدەنگی زانایانی لەسەرە بە پشت بەستن بە سەدان بەڵگەی قورئان و سوننەت.

بەڵێ؛ ووشەی (الـــلە) عەلەمە بۆ ناوی (خـودا) و موشتەقیش نییە (پاش بوونی بە عەلەم) لە هیچ فیعلێکەوە، بەڵام خۆ ووشەیەکی عەرەبیەو هەموو وشەیەکی عەرەبیش بنچینەیەکی زمانەوانی خۆی هەیە، بۆیە دەڵێن:

ووشەی (الله) لە بنچینەو ئەسڵی ووشەکەدا، لە ئیلاهەوە هاتووە، إلاە(إلـه) لەسەر وەزنی (فِعال) ەو بە واتا مەفعولەکەیەتی.

چونکە خودا(الله): (مألوه) ە ، واتە: (معبود) و پەرستراوە. وەک ابن منظور لە (اللسان) یدا دەڵێت:" كما تقول (إمام) على وزن (فعال) بمعنى مفعول، لأنه مؤتم به، فلما أُدخلت عليه الأَلف واللام حذفت الهمزة تخفيفاً لكثرته في الكلام، ولو كانتا عوضاً منها لما اجتمعتا مع المعوَّض منه في قولهم: (الإلاهُ)، وقطعت الهمزة في النداء(يا ألله) للزومها تفخيماً لهذا الاسم...تفرد الله سبحانه بهذا الاسم، فلا يجوز لغيره"[23].

**کەواتە:** ئەوەی دروست نییە ئەوەیە کە حەرامە هیچ کەسێک ناوی (الله) لە خۆی یان منداڵەکەی بنێت، چونکە ئەو ناوە پیرۆزە یان وەرگێڕاوەکەی وەک (خودا) بە کوردی عەلەمە تەنها بۆ زاتی خودا (جل جلاله)، واتە کورد لە زاراوەی خۆیاندا

(23) لسان العرب، لأبي الفضل، جمال الدين ابن منظور: (١ /١٥).





تەنها بۆ خودا ی بەکاردەهێنن. بەڵام کێشەیەک نییە لە وەرگێڕانی واتاکەیدا بۆ زمانێکی تر. هەروەک چۆن کێشەیەک لە وەرگێڕانی ناوەکانی تر و سیفەتاکانی تری خودا.

**واتە:** دروستە (الله) بە هەر زمانێکی تر بەزاراوەی هاوواتای ئەو بەیان بکرێت، با بە یەک ووشەیش بێت وەک ووشەی (خودا)، جگە لەو جێگانەدا کە واجبە دەربڕینی پێ بکەیت، وەک لە کاتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز یان کاتی نوێژ لە خوێندنی سورەتی فاتیحەدا، یان زیکرەکانی ناو نوێژ بۆ کەسێک بتوانێت بە عەرەبی بیبیانڵێت، ئەمەیش لە سەر مەزهەبی جمهوری زانایان.

بەڵام لە مەزهەبی پێشەوا ئەبوو حەنیفەدا تێکڕای ئەوانەی باسمان کردن با بشتوانێت بە عەرەبی بیبیانڵێت هەر دروستە بە زمانەکەی خۆی لە نێو نوێژیشدا زیکرەکان بکات، بە نمونە لە جیاتی ئەوەی لە کاتی دەستپێکردنی نوێژدا بڵێ (الله اکبر) درووستە بڵێت (خودا گەورەترە) وەک دواتر روونی دەکەینەوە.

بەڵام لە کاتی تردا وەک تەفسیرکردن و گوتاردان و ئامۆژگاری کردن، چ بڵێیت الله (جل جلاله) وا دەفەرموێت، چ بڵێیت (خودا) یان(خودێ) یان (خوا) یان (خوڵا) بە پێی جیاوازی لەهجە کوردییەکان، یان بڵێ (پەروەردگار) (جل جلاله) وا دەفەرموێت، هیچ جیاوازیەکی نییە..

تەنانەت لە جیاتی ئەوەی سوێند بە (الله) بخوات و بڵێت: (والله)..ئەگەر بە کوردی یان با فارسی سوێندی بە (خودا) خوارد هیچ کێشەیەکی شەرعیی نییەو بە





کۆی رای زانایان سوێندەکەی دادەمەزرێت، وەک پاشتر دەقەکانی فوقەها نەقڵ دەکەین.

هەروەها هیچ کەس نەیگوتووە (سوێند یان تەڵاق یان اقرار یان عیتاق یان ظیهار ئیلاء یان نیکاح) تەنها بە لەفزە عەرەبیەکان دادەمەزرێت، جگە لە خیلافێک کە نەقڵکراوە لە ئیمامی شافیعی وە (رحمه الله) بە نیسبەت نیکاحەوە..لە کتێبەکاندا مەشهورە.

بە نیسبەت سوێندەوە کە لە هەمووی گرنگترە بە کۆی رای زانایان دروستە سوێندخواردن بە هەموو زمانێک و لە شەرعیشدا بە عەرەبی و غەیری عەرەبی سوێند خواردن یەک حوکمی هەیە. چ بە ناوی الله یان واتاکەی لە زمانێکی تردا، هەروەها بە ناوەکانی تری و بە سیفەتەکانی بە عەرەبی بێت یان هەر زمانێکی تر، جیاوازی نییەو دادەمەزرێت، ئەمەیش رای تەواوی زانایانە، لێرەدا هەندێ لە عیبارەتی زانایان نەقڵ دەکەین بۆ زیاتر دڵنیایی لەوانەیش:

1- قال العلامة برهان الدين أبي الحسن المرغيناني الحنفي في كتابه الهداية في شرح بداية المبتدي :" ولو قال بالفارسية (سوگند ميخورم بخُداي) (أي أحلف بالله) يكون يمينا "[24].

(24) الهداية في شرح بداية المبتدي، أبو الحسن برهان الدين علي بن أبي بكر الفرغاني المرغيناني الحنفي (ت: 593هـ)، بتحقيق: طلال يوسف :(2/ 319).






2- وقال العلامة الخطيب الشربيني الشافعي في مغني المحتاج: "ولا فرق بين أن يحلف بالفارسية أو بغيرها"[25].

3- وقال الشيخ كمال الدين ابن همام الحنفي في شرح فتح القدير:" لو قال بالفارسية (سوگند ميخورم بخُداى) يكون يمينا، لأنه للحال لأن معناه أحلف الآن بالله"[26].

4- قال أبو محمد علي بن حزم الظاهري في المحلى بالآثار: " لا يمين إلا بالله (عز وجل)، إما باسم من أسمائه تعالى، أو بما يخبر به عن الله تعالى ولا يراد به غيره، مثل: مقلب القلوب، ووارث الأرض وما عليها، الذي نفسي بيده رب العالمين، وما كان من هذا النحو، ويكون ذلك بجميع اللغات ، أو بعلم الله تعالى، أو قدرته، أو عزته، أو قوته، أو جلاله، وكل ما جاء به النص من مثل هذا؛ فهذا هو الذي إن حلف به المرء كان حالفا، فإن حنث فيه كانت فيه الكفارة"[27].

هەروەها (الإِلَه) یش واتە (أَلله)، ئەگەرچی کاتێک ئەلفولامەکەی لێ دەکیتەوە لە زمانەوانیدا دەگوترێت بە هەر پەرستراوێکی تریش جگە لە زاتی خودا دەگرێتەوە ، بەڵام کە ئەلفولامی تەعریفی خرایە سەر دەبێتە (الله)و بووەتە ناوی عەلەم بۆ

---

(25) مغني المحتاج إلى معرفة معاني ألفاظ المنهاج، شمس الدين محمد بن أحمد الخطيب الشربيني الشافعي (ت: 977هـ): (6/ 199).

(26) شرح فتح القدير، كمال الدين محمد بن عبد الواحد السيواسي الحنفي ت681هـ:(5/ 75).

(27) المحلى بالآثار، أبو محمد علي بن حزم الأندلسي الظاهري (ت: 456هـ): (6/ 281).





خودای تاک و تەنها وە هیچ جۆرە ئیشتیقاقێکی فیعلی لەو ناوەوە ناکرێت، وەک (ابن منظور) دەیگێڕێتەوە لە الخليل ی فەراهیدییەوە کە گوتویەتی:" الله، لا تُطرحُ الأَلفُ من الاسم، إنما هو الله (عزَّ ذكرُه) على التمام، وليس هو من الأَسماء التي يجوز منها اشْتقاق فِعْلٍ كما يجوز في الرحمن والرحيم"[28].

بەڵام ئەسڵی ئیشتیقاقی ناوی (اللهُ) لە زمانی عەرەبیدا( إلاه )بووە، پاشان بە ئەلی تەعریف بووە بە (الإلاهُ)، بەڵام عەرەب هەمزەکەیان لە بەر ئاسانکاری سەر زوبان لابردووە ووشەکە بووە بە (أَلِلاهُ)، پاشان تەحریکی لامی تەعریفیان کردووە، و لامی یەکەمیان لە دووەمدا دەغم کردووە بووە بە (الله)[29].

هەروەها دەکرێت بگوترێت بنچینەی لە زمانەوانیدا ووشەی الله (إلاهٌ) (ئیلاهون)بووە، وەک قورئانیش دەفەرموێت: **{ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَد وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنۡ إِلَـٰهٍۚ إِذا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَـٰهِۭ بِمَا خَلَقَ }**[30]

ووشەی (إله)یش دەگەڕێتەوە بۆ (لاَهَ) لە سەر وەزنی (فَعَلَ) وەک پێشەوا (ابو إسحاق الزجاج ت٣١١) دەفەرموێت[31] .

---

(28) لسان العرب: (١١٤/١).

(29) بڕوانە: لسان العرب : ١ / ١١٤. مادەی (أَلِهَ).

(30) (سورة المؤمنون:من الآية ٩١).

(31) تفسير أسماء الله الحسنى، لأبي اسحاق ابراهيم بن السري الزجاج، بتحقيق: احمد يوسف الدقاق : ص ٢٥).






(إله) یش واتە: (المستحق بالعبادة دون من سواه)چونکە پەرستراوی بە هەق تەنها زاتی حەق تەعالایە واتە (الله) بە عەرەبی.

(ابن الهیثم) یش دەڵێت: ئەسڵی (إلاە) (ولاە) بووە، بە واو، قەلبی واوەکە کراوە بە هەمزە، وەک وشڵح و وجاح، واتای ولاهیش ئەوەیە کە خەڵکی دەپاڕێنەوە لێی بۆ کارەکانیان، قال:" وأَصل إلَهٍ وِلاهٌ، فقلبت الواو همزة، كما قالوا: للوِشاح إِشاحٌ، وللوِجاحِ وهو السِّتْرُ إِجاحٌ، ومعنى ولاهٍ أَن الخَلْقَ يَوْلَهُون إليه في حوائجهم ويَضْرَعُون إليه فيما يصيبهم ويَفْزَعون إليه في كل ما ينوبهم كم يَوْلَهُ كل طِفْل إلى أُمه"[32].

ئەم لەفزەیە (الله) بەڵێ عەلەمە بۆ زاتی خودا، و خودی عەلەمیش لە زمانەوانیدا ناگونجێت وەرگێڕانی بۆ بکرێت، بەڵام دەکرێت مەفهوم و واتاکەی وەڕگێڕانی بۆ بکرێت، کە بریتیە لە ناوی: (خودا) بە کوردی و بە فارسی، یان God بە ئینگلیزی..هەتا دوایی.

چونکە لە زمانی کوردی و فارسی دا بە نمونە کە دەگوترێت (خودا) ، ئیتر جگە لە زاتی (الله) هیچ پەرستراوێکی تر نایەتە زیهنەوە لە کاتێکدا ئەو دوو نەتەوە هەزارو چوارسەد ساڵە خودا بەو چەشنە دەناسن و هیچ زانایەکی پێشینەیش نەیگوتووە دروست نییە وەرگێڕانی واتای (الله) بۆ زمانێکی تر..

---

(32) لسان العرب: ( ١/ ١١٤-١١٥).





ئەوانەی کە دەڵێن نابێت عەلەم تەرجەمە بکرێت ئەوە جیاوازییان نەکردووە لە نێوان لەفز و مەعنادا، واتە ئەسڵی ووشەکە لەگەڵ ماناکەیدا، هەروەها نازانن کە (وجود) لە سەر سێ بەشە: وجودی ئەعیان و وجودی زیهنی و وجودی سەر زوبان، واتە لەفزی.

هەروەها نازانن (وەک پێشەوا حجة الاسلام ی غەزالی دەفەرموێت): کە ناو (اسم)غەیری ناوەرۆک و ناوبراوەکەیە، واتە غەیری (مسمی)کە ، هەروەها ناو بریتیش نییە لە وەضعی ناوەکەیش کە پێی دەگوترێت (تسمیة)، واتە (اسم و مسمی و تسمیة)سێ شتی لەیەکتر دورن ، لە جیهەتێکەوە (تباین) هەیە لەنێوانیادا بەڵام لە جیهەتێکی ترەوە (تطابق) هەیە لە نێوانیاندا، بە نمونە ناو و ووشەی (خودا) یان (الله) لەو سێ جۆر وجودەیدا، یەکێکیان قەدیمە، کە وجودی عەینییەو پەیوەستە بە زات و سیفاتی ئەزەلی خودا وە، دوانەکەی تر کە ووجودی ووشەکەیە واتە ووشەی (الله) لە زیهنی من و تۆدا ، هەروەها وجودی گوتن و (تلفظ) بە وشەکەیە لە سەر زارماندا، هەر دووکیان پەیدابوون و (حادث)ن.[33]

بۆ هەمان مەبەست و بە هەمان شێواز پێشەوا (فخر الدین) ی رازی لە تەفسیری ئایەتی **{ولله الأسماء الحسنى}** دەفەرموێت:" المسألة الخامسة: دلت الآية على أن الاسم غير المسمى، لأنها تدل على أن أسماء الله كثيرة لأن لفظ الأسماء

---

(33) بڕوانە: المقصد الأنسى في شرح معاني أسماء الله الحسنى، للإمام الغزالي بتحقيق: بسام عبدالوهاب الجابي: ١٤٠٧: ص ٢٤).






لفظ الجمع، وهي تفيد الثلاثة فما فوقها، فثبت أن أسماء الله كثيرة ولا شك أن الله واحد، فلزم القطع بأن الاسم غير المسمى، وأيضا قوله: (ولله الأسماء الحسنى) يقتضي إضافة الأسماء إلى الله، وإضافة الشيء إلى نفسه محال. وأيضا فلو قيل: (ولله الذوات) لكان باطلا. ولما قال: (ولله الأسماء) كان حقا، وذلك يدل على أن الاسم غير المسمى"[34].

بۆیە ناکرێت لەفزی ناو عەینی مەفهومی ناوبراو بێت ، ئەگەرنا کەسێک کە ناوی الله لە دڵیایەتی و لە زیهنییایەتی یان لەسەر زاریەتی، ئایا دروستە بڵێین زاتی خودا لە زیهنو سەر زاریەتی؟

بێگومان ئەوە کوفرەو مەحالە خودا بچێتە نێو هیچ مەخلوقێکی، بەڵام جائیزە خودی لەفزەکەی ، چونکە خودی لەفزی (الله) نەک ناوبراوەکە (حادث) ە، و پەیدابووە.. بە پێچەوانەی (مسمی) کە، کە زاتی (الله) یە (جل جلالە).

کەوابوو هەردوو زاراوەکانی(الله)،(خودا)، چ بە عەرەبی و چ بە عەجەمی، لە خودی خۆیاندا تازەن و ئەزەلی نیین، بەڵام مەعناو مەبەست و مەفهومەکەیان کە زاتی خودا و سیفەتەکانیی دەگرێتەوە قەدیم و ئەزەلین، وەک پێشەوا حجة الاسلام ی غەزالی(ت٥٠٥هـ) دەفەرموێت: " معاني الألفاظ كانت ثابتة في الأزل، ولم تكن الأسماء[أي موجودة]، لأن الأسماء عربية وعجمية، وكلها حادثة، وهذا في كل اسم

---

(34) تفسير الرازي = مفاتيح الغيب أو التفسير الكبير: (15/ 416).





يرجع الى معنى الذات أو صفة الذات، مثل القدوس فإنه(تعالى) كان بصفة القدس في الأزل، ومثل العالِم فإنه كان عالما في الأزل "[35].

هەروەها (ابن تيمية) لە (الفتاوى) يدا ئەوەی ئیمامی غەزالی سەلماندووە دەڵێت: " نقول في الكلام (أي كلام الله) إنه واحد لا يشبه كلام المخلوقات، ولا هو بلغة من اللغات، ولا يوصف بأنه عربي أو فارسي أو عبراني، لكن العبارات عنه تكثر وتختلف، فإذا قرئ كلام الله بلغة العرب سمي قرآنا، وإذا قرئ بلغة العبرانية أو الفارسية سمي توراة وإنجيلا، كذلك الرب سبحانه يوصف بالعربية (الرحمن الرحيم) وبالفارسية (خداي بزرگ) وبالتركية (سركوي ) ونحو ذلك وهو سبحانه واحد والتسمية الدالة عليه تكثر"[36].

بە نموونە: زاتی خودا تاک و تەنهایە بەڵام ناوەکانی زۆرن وەک دەفەرموێت: **{وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَا }**[37] خۆ ئەگەر سیفاتیش عەینی زات بوایە ئەوا فرە زاتی (تعدد الذات) یان (تعدد القدماء) دروست دەبوو، بە گوێرەی بوونی فرە صیفاتی و فرە ناوی خودا (تعدد الصفات والأسماء)، ئەوەیش خۆ مەحاڵە هەم لە

(35) المقصد الأنسى للإمام الغزالي: ص ٣٦).

(36) الفتاوى الكبرى، أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني أبو العباس، تحقيق: حسنين محمد مخلوف: (6/ 567).

(37) (سورة الأعراف: ١٨٠).






رووی شەرعەو عەقڵەوە، بەئایەتەکانی: **{قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ}** [38] **{ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَاۚ فَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ }** [39]

بۆیە زانایانی ئەشاعیرە کە تەمسیلی ئەهلی سوننەت دەکەن فەرمویانە سیفاتی خوا نە دەگوترێت خودی خوایە نە دروستیشە بگوترێت غەیری خودایە، بەڵکو سیفاتی ئەزەلی ئەبەدی خودایەو لێی جودا نابێتەوە[40].

بەڵام دەکرێت بگوترێت بە قەیدی ئیعتیبار: ئیسمی الله یان الرحمن یان الرحیم و هەر ناوێکی تری.. واتای ناوەکە واتای موسەماکە دەبەخشێت، کە زاتی الله یە، هەروەها واتای زاتیش واتای ناوەکانی و سفەتەکانی دەبەخشێت، بەو ئیعتیبارەی کە زات و سیفاتی خودا لەیەکتر جودا نابێت بکرێنەوە..

هەروەها لە بەر ئەوەی کە ئەو بەناو خودایانەی کە موشریکەکانی عەرەب دەیانپەرستن هیچ وجودێکی عەینی حەقیقییان نەبوو کە تەعبیربێت لە مەفهومی (خودا) ی راستەقینە کە زاتی (الله) یە. تەنانەت لە وجودە زیهنیەکەیشیاندا، خودا بەدرۆی خستنەوە و فەرموی پێیان: **{ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ**

---

(38) (سورة الإخلاص:١).

(39) (سورة الأنبياء: ٢٢).

(40) (المقصد الأنسي: ص ٢٤).






أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍۚ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ} (41)

خودا له قورئانيدا نه‌يفه‌رمووه ته‌نها به زمانى عه‌ره‌بى بانگم بكه‌ن يان ستايشم بكه‌ن..به‌ڵام له‌به‌ر ئه‌وه‌ى قورئان به عه‌ره‌بى هاتووه‌ته خواره‌وه فه‌رمويه‌تى: (الله، رب العالمين، الرحمن، الرحيم..)هتد.

خۆ ئه‌گه‌ر به زمانى عيبرى بهاتايه‌ته خواره‌وه ده‌يفه‌موو (ئيل)، چونكه (ئيل) له‌و زمانانه‌و سيريانى كۆنيشدا به پێى سه‌رچاوه‌كان واته (الله) واته: خودا،

هه‌مان ئه‌و ناوه‌يش له قورئان و سوننه‌ته‌دا دا هاتووه له ووشه‌ى (اسرئيل) دا هه‌روه‌ها (جبرائيل) و (ميكائيل) به چه‌ندين شێواز به ئه‌لف و هه‌مزه‌و ته‌خفيف و ياء..هاتووه،

خۆ ئه‌گه‌ر دروست نه‌بوايه غه‌يرى الله به‌كاربێت ده‌بوو قورئان بيفه‌رموايه: (إسراالله)، (جبرا الله) (ميكا الله)..

به چه‌ند قيرائه‌تێكيش ناوه‌كانيان هاتووه به نمونه:(جبريل، جبراييل، جبرائيل)(42).

---

(41) (سورة يوسُف:٤٠)، بڕوانه بۆ زياتر: (المقصد الأنسى للامام الغزالي: ص ٣٧).

(42) بڕوانه: (الحجة لابن خالويه: ص٢٣، النشر في القراءات العشر لابن الجزري الشافعي: ٢/ ٢٤٩، معجم القراءات للخطيب: ٢٢٧/١-٢٢٣) نقلا عن: (أثر القراءات القرآنية في الصناعة المعجمية تاج العروس نموذجا، د. عبدالرزاق القادوسي: ص ١٢٤).






کەواتە: ئەمە بەڵگەی یەکلاکەرەوەیە کە دروستە ناوی (الله) ببرێت بە هەموو زمانەکان بە بێ جیاوازی، وە دروستە وەربگێڕدرێتە سەر زمانەکانی تر، هەر وەک قورئان لە تەرجەمەی (الله) دا ووشەی (ئیل) یان (ییل) یان (یل)یان (ئیلا) یان (ئل)، یان(عیلا) بە سەر زاری عیبری یان سریانی(بەپێی جیاوازی رای زانایان) لە قورئاندا زۆرێکیان بەکار هاتوون بە پێی جیاوازی قیرائاتی قورئانی وەک پێشتریش باسمانکرد.

لێرەشدا چەند دەقێکی گەورە زانایانی تەفسیر لەو رووەوە بە زبانی عەرەبی بۆ زیاتر دڵنییایی نەقڵ دەکەین لەوانەیش:

١- قال العلامة الشيخ سليمان عمر بن منصور العجيلي الأزهري الشافعي، المعروف بالجمل (المتوفى: 1204هـ)، في حاشيته: (حاشية الجمل على شرح المنهج:" (فائدة) مهمة اسم (الله) بالعبرية (إيل) وبالعبرانية (إيل وآئيل وأيلا) وبالسريانية (إيلا أو عيلا) وبالفارسية (خداي) وبالخزرية (تندك) وبالرومية (شمخشا) وبالهندية (مشطيشا) وبالتركية (ببات) وبالخفاجية (أُغان) بغين معجمة بعد الهمزة المضمومة وبالبلغارية (تكري) وبالتغرغرية بمعجمتين ومهملتين بعد الفوقية (أُلُه) بهمزة ولام مضمومتين والله أعلم اهـ"[43].

---

(43) حاشية الجمل على شرح المنهج = فتوحات الوهاب بتوضيح شرح منهج الطلاب:(336/1).





2- قال الامام الحافظ ابو محمد البغوي الشافعي في تفسيره: "ومعنى إسرا، عبد، وإيل: هو الله تعالى، وقيل : صفوة الله"[44].

3- قال الإمام أبو القاسم محمود بن عمرو بن أحمد، الزمخشري جار الله (المتوفى: 538هـ) في تفسيره الكشاف:" إِسْرائِيلَ هو يعقوب (عليه السلام) لقب له، ومعناه في لسانهم: صفوة اللَّه، وقيل: عبد اللَّه. وهو بزنة إبراهيم وإسماعيل غير منصرف مثلهما لوجود العلمية والعجمة. وقرئ: إسرائل، وإسرائلّ"[45].

٤- قال الإمام المفسر ابن عطية في تفسيره:" وإِسْرائِيلَ هو يعقوب بن إسحاق بن إبراهيم عليهم السلام، وهو اسم أعجمي يقال فيه إسراءل وإسرائيل وإسرائيل، وتميم تقول إسرائين، وإسرا هو بالعبرانية عبد وإيل اسم الله تعالى فمعناه عبد الله"[46].

٥- قال الإمام الألمعي المفسر الأصولي فخر الدين الرازي:" اتفق المفسرون على أن إسرائيل هو يعقوب بن إسحق بن إبراهيم ويقولون إن معنى إسرائيل عبد الله لأن «إسرا» في لغتهم هو العبد و «إيل» هو الله وكذلك جبريل، وهو عبد الله

---

(44) تفسير: معالم التنزيل للإمام أبي محمد البغوي الشافعي: (١٠٩/١).

(45) تفسير الكشاف عن حقائق غوامض التنزيل، أبو القاسم محمود بن عمرو بن أحمد، الزمخشري جار الله (ت: 538هـ): (130/1).

(46) تفسير المحرر الوجيز في تفسير الكتاب العزيز، أبو محمد عبد الحق بن غالب بن عطية الأندلسي المحاربي المالكي الأشعري (ت: 542هـ) بتحقيق: عبد السلام عبد الشافي محمد: (1/ 133).





وميكائيل عبد الله. قال القفال: قيل: إن «إسرا» بالعبرانية في معنى إنسان، فكأنه قيل: رجل الله، فقوله: يا بني إسرائيل خطاب مع جماعة اليهود الذين كانوا بالمدينة من ولد يعقوب (عليه السلام) في أيام محمد (صلى الله عليه وسلم)"[47].

6- قال الإمام الفقيه الأصولي أبو محمد عز الدين عبد العزيز بن عبد السلام بن أبي القاسم بن الحسن السلمي الدمشقي، الملقب بسلطان العلماء، الشافعي الاشعري (ت:660هـ) في تفسيره::" {إسرائيل} يعقوب، إسرا - بالعبرانية - عبد، وإيل هو الله - تعالى - فهو عبد الله "[48].

7- قال الإمام الفقيه أبو عبد الله محمد بن أحمد بن أبي بكر بن فرح الأنصاري الخزرجي شمس الدين القرطبي المالكي الأشعري في تفسيره:" وإسرائيل : اسم أعجمي ولذلك لم ينصرف وهو في موضع خفض بالإضافة وفيه سبع لغات إسرائيل وهي لغة القرآن وإسرائيل بمدة مهموزة مختلسة حكاها شنبوذ عن ورش وإسراييل بمدة بعد الياء من غير همز وهي قراءة الأعمش وعيسى بن عمر ، وقرأ الحسن والزهري بغير همز ولا مد وإسرائِل بغير ياء بهمزة مكسورة ، وإسراءَل بهمزة مفتوحة ، وتميم يقولون إسرائين بالنون. ومعنى إسرائيل عبدالله قال ابن

---

(47) تفسير الرازي = مفاتيح الغيب أو التفسير الكبير أبو عبد الله فخر الدين محمد بن عمرالرازي الملقب بابن خطيب الري الشافعي الأشعري (ت: 606هـ): (3/ 474).

(48) تفسير القرآن، أبو محمد سلطان العلماء عز الدين عبد العزيز السلمي الدمشقي الشافعي الاشعري (ت:660هـ)، بتحقيق: الدكتور عبد الله بن إبراهيم الوهبي: (1/ 121).






عباس : إسرا بالعبرانية هو عبد وإيل هو الله ، وقيل إسرا هو صفوة الله وإيل هو الله وقيل إسرا من الشد فكأن إسرائيل الذي شده الله وأتقن خلقه ، ذكره المهدوي. وقال السهيلي : سمي إسرائيل لأنه أسرى ذات ليلة حين هاجر إلى الله تعالى فسمي إسرائيل أي أسرى إلى الله ، ونحو هذا فيكون بعض الاسم عبرانيا وبعضه موافقا للعرب والله أعلم"[49].

8- قال الإمام المفسر الأصولي ناصر الدين أبو سعيد عبد الله بن عمر بن محمد الشيرازي البيضاوي الشافعي الأشعري في تفسيره:" وإسرائيل لقب يعقوب (عليه السلام) ومعناه بالعبرية: صفوة الله، وقيل: عبد الله وقرئ «إسرائل» بحذف الياء و «إسرال» بحذفهما و «إسراييل» بقلب الهمزة ياء"[50].

9- قال الإمام المحدث الصوفي زين الدين محمد عبد الرؤف المناوي الشافعي الأشعري في كتابه (التوقيف على مهمات التعاريف):" جبريل اسم عبودية ، لأن (إيل) اسم من اسماء الله في الملأ الأعلى"[51].

---

(49) تفسير الجامع لأحكام القرآن، أبو عبد الله محمد بن أحمد الأنصاري الخزرجي شمس الدين القرطبي المالكي الأشعري(ت 671 هـ)، بتحقيق: هشام سمير البخاري: (331/1).

(50) تفسير أنوار التنزيل وأسرار التأويل، ناصر الدين أبو سعيد عبد الله بن عمر بن محمد الشيرازي البيضاوي الشافعي الأشعري (ت 685هـ) بتحقيق: محمد عبد الرحمن المرعشلي:(1/ 75)

(51) (التوقيف على مهمات التعاريف، زين الدين محمد عبدالرؤف المناوي الشافعي الأشعري، تحقيق: محمد رضوان الداية: ص ٢٣٠).





کەواتە ئەو فیکرە تازە داهێنراوەی کە لای هەندێک دروست بووەو شەرم دەکات لە جیاتی ووشەی الله ی عەرەبی، ووشەی ( خودا ) بە کوردی بەکاربهێنێت لە دەستەواژەی گوتار و نوسین و ئامۆژگاریدا زۆر هەڵەیەو بە لاڕێدا چووە، هەروەها نەزانینە بە بەڵگەکانی قورئان و سوننەت و زمانی عەرەبی و ڕێڕەوی زانایانی سەلەفی ساڵح کە هەر زانایەک بە زمانەکەی خۆی ستایشی خودای کردووەو نوسینی بە زمانی خۆی ئەنجامداوە لە ئوممەتانی پێش ئیسلام و نەتەوەکانی ئوممەتی نێو ئیسلامیش.

**بە نمونە:**

سەیرکە بە درێژایی مێژوو ئەوانەی بە زمانی غەیری عەرەبی کتێبیان نوسیوە وەک زانایانی کورد و فارس و هیند و ..هتد ووشەی خودا یان لە تەواوی نوسین و ئەدەبی نوسێنیاندا بەکارهێناوە، کە نمونە زۆرن لە زانایانی پێشینە ئیمامی غەزالییە لە کتێبی (کیمیای سەعادت) [52] ی کە تیایدا بەردەوام (حجة الإسلام) یان دەفەرموێت: (خدای تعالی)، یان: (حق تعالی).

هەروەها شێخی سەعدی شیرازی مصلح الدین بن عبدالله کە قوتابی پێشەوا ابن الجوزی بووە لە (گلستان) یدا لە سەرەتاکەیدا دەفەرموێت: "منت خداي را (عزّوجل) كه طاعتش موجب قربت است و به شكراندرش مزيد نعمت٬ هر نفسي

(52) کيمياي سعادت امام غزالي، تحقيق (م. حسين خديوجم، چاپی ١٣٨٠).






که فرو مي‌رود ممد حيات است و چون برون مي‌آيد مفرح ذات پس در هر نفس دو نعمت موجود است و بر هر نعمت شكري واجب"[53].

هەروەها له زانایانی هاوچەرخیشدا پێشەوا مامۆستا مەلا عبدالكريمی بیارە یە لە تەواوی دانراوەکانیاندا..ناوی پیرۆزی الله ی بە خودا ناوبردووە، تەواوی زانایانی کوردی تریش کە لە ژماردن نایەن و هەموانیش دەیزانن..

بەڵام وەک پێشتریش گوتمان یادی خودا بە لەفزی جەلالە کە لە قورئاندا بە (الله) هاتووە بێ گومان بۆ کاتی زیکرکردن باشترە، واتە بڵێیت (یا الله) باشترە لەوەی کە بڵێت: (ئەی خودا)، یان بڵێیت (سبحان الله) باشترە لەوەی کە کە بڵێیت: (پاک و بێگەردی بۆ خودا)، چونکە ئەوانە لە ویردو یادە وەرگیراوەکانی قورئان و سوننەتن (الأدعية المأثورة)، بەڵام تەرجەمەی ئەو دەستەواژانەیش وێڕای دروستییەکەی هەر زیکرەو ئەجری خۆی هەیەو هیچ کێشەیەکیان نییە لە رووی شەرعەوە، بەتایبەت کاتی وەعزو ئامۆژاری و نوسین و پاڕانەوەو موناجاتی پەروەردگار..

قورئـــانیش ئاشــکرایە کە کەلامە نەفســییە ئەزەلــیەکە قەدیــمەو وەســفیش ناکرێــت ئەو کەلامە بە هــیچ زمانێــک، نە بە عەرەبــی و نە بە عیــبری و فارســی و ســیریانی، وەختێــک خــودا کەلامــی خــۆی نــازڵ کــرد بە عەرەبــی ئینجــا پێــی گــوترا قورئـــان و پێشــتریش کە بە زمانەکـــانی نـــازڵ بـــووە نـــاونراوە تەورات و

(53) گلستان، سعدی شيرازي: چاپی تهران، ص3.






ئینجیــل و زەبوور..هتــد، وە هــیچ کێشــەیەکی نیــیە تەرجەمەی تەواوی قورئــان بە نــاو و سـیفەتەکانی خودایشــەوە بـۆ سـەر هەر زمانێـک کە بتەوێـت، بەڵکـو بە مەبەســتی گفتوگــۆ و تێگەیانــدنی غەیــرە عەرەب تەرجەمەکردنیــان جــاری وا هەیە ســوننەتەو جــاری وایــش هەیە واجــبە وەک ابــن تیمیــة ی حەرانــی لەو بارە لە دوو کتێبیدا دەڵێت:

1- قال ابن تيمية في (درء تعارض العقل والنقل) تحت مبحث(جواز مخاطبة أهل الاصطلاح باصطلاحهم) ما نصه:"وأما مخاطبة أهل الاصطلاح باصطلاحهم ولغتهم فليس بمكروه، إذا احتيج إلى ذلك وكانت المعاني صحيحة، كمخاطبة العجم من الروم والفرس والترك بلغتهم وعرفهم، فإن هذا جائز حسن للحاجة، وإنما كرهه الأئمة إذا لم يحتج إليه. ولهذا «قال النبي (صلي الله عليه وسلم) لأم خالد بنت خالد بن سعيد بن العاص ـ وكانت صغيرة فولدت بأرض الحبشة، لأن أباها كان من المهاجرين إليها ـ فقال لها يا أم خالد، هذا سنا» والسنا بلسان الحبشة الحسن، لأنها كانت من أهل هذه اللغة. ولذلك يترجم القرآن والحديث لمن يحتاج إلي تفهمه إياه بالترجمة، وكذلك يقرأ المسلم ما يحتاج إليه من كتب الأمم وكلامهم بلغتهم، ويترجمها بالعربية، كما «أمر النبي






(صلي الله عليه وسلم) زيد بن ثابت أن يتعلم كتاب اليهود، ليقرأ له، ويكتب له ذلك» حيث لم يأتمن اليهود عليه"[54].

٢- وقال في بيان تلبيس الجهمية:" اذا اثبت الرجل معنى حقا ونفى معنى باطلا واحتاج الى التعبير عن ذلك بعبارة لأجل إفهام المخاطب لأنها من لغة المخاطب ونحو ذلك، لم يكن ذلك منهيا عنه، لأن ذلك يكون من باب ترجمة أسمائه وآياته بلغة أخرى ليفهم أهل تلك اللغة معاني كلامه وأسمائه، وهذا جائز، بل مستحب أحيانا، بل واجب أحيانا..ثم قال:" اذا كانت المعاني التي تبين لهم هي معاني القرآن والسنة تشبه قراءة القرآن بغير العربية وهذه الترجمة تجوز لإفهام المخاطب بلا نزاع بين العلماء"[55].

خوێنەری ئازیز:

ئەگەر وانەبا خودا قەدەغەی دەکرد لە موسڵمانان بە جگە لە زمانی عەرەبی بیپەرستن، تەنانەت لە مەزهەبی پێشەوا ئەبو حەنیفەدا (تەرجەمەی واتای سورەتی فاتیحە بە زمانێکی تر وەک فارسی لەکاتی نوێژیشدا بە موتڵەقا ) دروستە، واتە بتوانێت سورەتی فاتیحە بخوێنێت یان نەتوانێت، بەڵام پێشەوایانی هاوەڵی (ابو

---

(54) درء تعارض العقل والنقل، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم ابن تيمية الحراني الحنبلي الدمشقي (ت: 728هـ)، تحقيق: الدكتور محمد رشاد سالم: (1/43-44).

(55) بيان تلبيس الجهمية في تأسيس بدعهم الكلامية، أبو العباس أحمد عبد الحليم بن تيمية الحراني، تحقيق : محمد بن عبد الرحمن بن قاسم: (2/ 389).







یوسف و محمد) ی شەیبانی فەرمویانە: دروستە تەرجەمەی فاتیحە بۆ کەسێک کە هێشتا سورەتی فاتیحەی لەبەر نەکردبێت یان نەتوانێت بیخوێنێتەوە.

لە مەزهەبی خۆشماندا واتە ئیمامی شافیعی کەسێک کە توانای بەسەر نزا وەرگیراوەکانی پاش خوێندنی تەحییات دا نەبێت دەتوانێت بە زمانی خۆی نزا بکات هەتا فێریان دەبێت، هەروەها تەسبیحاتەکانی تریش.

یەکێک لە بەڵگەکانی پێشەوا (ابو حنیفە) ئایەتەکەی سورەتی ئەنعامە: **{وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَۚ}**[56] دەفەرموێت: گرنگ ماناکەیەتی کە هەڕەشەی تێدابێت جا بە هەر زمانێک بێت لای ئەو دروستە با لە نوێژیشدا بێت و با لە بری سورەتی فاتیحەیش بێت.

بەڵام لای جمهوری زانایان دروست نییە مادام لە نوێژدا بێت.

1- قال الإمام شيخ الإسلام أبو زكريا يحيى بن شرف محيي الدين النووي الشافعي الأشعري(ت: 676هـ)، له (المجموع):" مذهبنا أنه لا يجوز قراءة القرآن بغير لسان العرب، سواء أمكنه العربية أو عجز عنها، وسواء كان في الصلاة أو غيرها، فإن أتى بترجمته في صلاة بدلا عن القراءة لم تصح صلاته، سواء أحسن القراءة أم لا، هذا مذهبنا، وبه قال جماهير العلماء منهم: مالك وأحمد وداود، وقال أبو حنيفة: تجوز وتصح به الصلاة مطلقا؛ وقال أبو يوسف ومحمد يجوز للعاجز دون القادر، واحتج لأبي حنيفة بقوله تعالى: **{قل الله شهيد بيني وبينكم وأوحي إلي هذا**

---

(56) (سُورَةُ الأَنۡعَامِ من سورة: ١٩).





**القرآن لأنذركم به}** قالوا: والعجم لا يعقلون الإنذار إلا بترجمته وفي الصحيحين إن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال: " أنزل القرآن على سبعة أحرف " وعن سلمان الفارسي (رضي الله عنه) أن قوما من الفرس سألوه أن يكتب لهم شيئا من القرآن فكتب لهم فاتحة الكتاب بالفارسية ولأنه ذكر فقامت ترجمته مقامه كالشهادتين في الإسلام وقياسا على جواز ترجمة حديث النبي (صلى الله عليه وسلم) وقياسا على جواز التسبيح بالعجمية واحتج أصحابنا بحديث عمر بن الخطاب (رضي الله عنه)...الخ"[57].

2- قال العلامة ابن قدامة المقدسي الحنبلي في شرح المقنع:" (مسألة) (فإن لم يحسن شيئا من القرآن لم يجز أن يترجم عنه بلغة أخرى، ولزمه أن يقول: سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر ولا حول ولا قوة إلا بالله) لا يجوز له القراءة بغير العربية سواء أحسن قراءتها بالعربية أو لم يحسن وهو قول الشافعي وقول أبي يوسف ومحمد إذا كان لا يحسن، وبه قال بعض أصحاب الشافعي، وقال أبو حنيفة: يجوز ذلك لقوله تعالى: **{وأوحي إلي هذا القرآن لأنذركم به ومن بلغ}** وإنما ينذر كل قوم بلسانهم ولنا قول الله تعالى: **{قرآنا عربيا}** وقوله: **{بلسان عربي مبين}**، ولأن القرآن لفظه ومعناه معجزة، فإذا غير خرج عن نظمه ولم يكن قرآنا ولامثله، وإنما يكون تفسيرا له، ولو كان تفسيره مثله لما

(57) المجموع شرح المهذب للشيرازي (مع تكملة السبكي والمطيعي) أبو زكريا محيي الدين يحيى بن شرف النووي الشافعي الأشعري(ت: 676هـ): (380/3).






عجزوا عنه إذا تحداهم بالإتيان بسورة من مثله، أما الإنذار فإذا فسره لهم حصل بالمفسر لا بالتفسير"[58].

3- قال العلامة القاضي أبو محمد عبد الوهاب بن علي المالكي في الإشراف عبى نكت مسائل الخلاف:" مسألة: إذا كان يحسن بالعربية فلا يجزيه الإحرام بالفارسية، خلافا لأبي حنيفة لقوله (عليه الصلاة والسلام): (يقول: الله أكبر) وقوله: (صلوا كما رأيتموني أصلي). (فصل): فأما إذا كان لا يحسن العربية، فعندي أنه يعتقد الدخول في الصلاة بقلبه، ولا يحرم بالفارسية، وأظن أن من أصحابنا من يقول: إنه يحرم بلسانه، وهو قول الشافعي فنقول: إنه ذكر من شرط صحة الصلاة، فوجب أن لا تصح إذا أتى به بغير العربية كالقراءة، ولأنه لا يخلو أن يكون المطلوب لفظ التكبير أو معناه، فأي ذلك كان وجب استواء القادر وغير القادر فيه"[59].

ئەمەی مەزهەبی جمهور تەنها لەكاتی نوێژدایە، له كاتی جگه له نوێژ هیچ كێشەیەكان نییه ئەوانیش له وەرگێڕانی ناوی خودا و زیكرەكان به كوردی یان هەر زمانێكی تر.

---

(58) الشرح الكبير على متن المقنع، للشيخ عبد الرحمن بن محمد بن أحمد بن قدامة المقدسي الجماعيلي الحنبلي، أبو الفرج،شمس الدين (ت: 682هـ): (1/ 531).

(59) الإشراف على نكت مسائل الخلاف، للقاضي أبو محمد عبد الوهاب بن علي بن نصر البغدادي المالكي (ت422هـ)، تحقيق: الحبيب بن طاهر: (1/227ـ 228).





کاتی نوێژیش لە مەزهەبی خۆیشمان(حەزرەتی شافیعی) و تەواوی زانایانی هەرچوار مەزهەب کەسێک ئەگەر نەیتوانی بە عەرەبی بڵێت: (الله اکبر) بۆ دابەستنی نوێژەکەی ئەوا دروستە بە زمانی خۆی وەک کوردی بڵێت: (خودا گەورەترە)

یان بە فارسی بڵێت (خدا بزرگتر) تا ئەو کاتەی کە فێر دەبێت، بەڵام لای حەزرەتی (ابو حنیفة) عەرەبیش بزانێت هەر دروستە بە زمانی خۆی(الله اکبر) ی دابەستنی نوێژ بڵێت ، بەڵگەی قورئانیشی هێناوەتەوە کە دەفەرموێت: **{ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ}**[60]، واتە: یادی خودا بکات و نوێژەکەی بکات، ئیتر جیاوازی نەکردووە لە نێوان هیچ زمانێکدا..هەندێ دەقی شەرعیی تر لەو بارەوە:

1ـ قال الإمام القاضي حسين الشافعي في التعليقة على مختصر المزني:" قال المزني: فإن لم يحسن بالعربية، كبَّر بلسانه، وكذلك الذكر، وعليه أن يتعلم. قال القاضي حسين: مثل إن كان تركيا أسلم، وهو لا يحسن العربية فيكبر بلسان الترك، أو هنديًا أسلم فيكبر بلسان الهند، وإن كان يحسن العربية فكبر بلسانه لم يجز، وكذا إن كان لا يحسن العربية، ولكن يمكنه أن يتعلم العربية، فلا يجوز له أن يكبر بلسانه، وإن مضى زمانه إمكان التعليم، ولم يتعلم فإنه يكبر بلسانه لحرمت الوقت، ويصلي فيلزمه إعادة تلك الصلاة. فأما إذا كان لا يمكنه أن يتعلم بالعربية بأن كان في الوقت ضيق، أو كان لا يطوع له لسانه، أو لم يجد من يعلمه، فإنه يكبر بلسانه

(60) (سورة الأَعلى: ١٥).





ولا يعيد الصلاة، ولكن ينبغي أن يقول: خداي بزرك بر، ولا يقول: خداي بزرك، لأنه لو اقتصر ينبغي أن يقول: خداي بزرك بر، ولا يقول: خداي بزرك، لأنه لو اقتصر عليه كأنه يقول بالعربية، الله الكبير، وقد ذكرنا أنه لا تنعقد به الصلاة، وهكذا حكم التشهد حكم التكبير، وقد ذكرناه. وقال أبو حنيفة: يأتي بالفارسية كلاهما، وإن كان يحسن العربية ولا شيءعليه، فأما سائر الأذكار، من دعاء الاستفتاح، وتسبيحات الركوع والسجود والدعاء بعد التشهد ماذا حكمه؟

فلا يخلو إما إن كان يحسب العربية أو لا، فإن كان يحسن العربية، على طريقة المراوزة لا يجوز له أن يأتي شيئًا منها بالفارسية، كالتكبير سواء، وعلى طريقة العراقيين يجوز له ذلك، لأنه ليس بفرض عليه إتيانه بخلاف التكبير، فأما إذا كان لا يحسن العربية على طريقة العراقيين يجوز له أن يأتي الكل بالفارسية، وعلى طريقة المراوزة فيه وجهان: أحدهما: يجوز كما في التكبير والتشهد. والثاني: لا يجوز، والفرق أن التكبير واجب عليه إتيانه فيه حاجة إلى أن يقوله بالعربية لأنه غير مختار فيه. وها هنا بعكسه، والوجهان صورهما من لفظ الشافعي، (رضي الله عنه) حيث قال: وكذلك الذكر، وعليه أن يتعلم، يحتمل أنه أراد به التشهد دون التسبيحات، لأنه قال: وعليه أن يتعلم، فإنما يجب تعلم التشهد دون سائر الأذكار، ويحتمل أنه أراد به الكل، لأن اسم الذكر ينطلق على الكل، وعليه أن يتعلم، ينصرف إلى التشهد. ولأن الشافعي، (رحمه الله) قال: حق على كل مسلم أن يتعلَّم من العربية قدر ما يأتي به في صلاته، وهذا بخلاف الفاتحة، فإنه لا يجزيه بالفارسية، فإن لم يحسنها، إن كان





يحسن شيئًا آخر من القرآن أتى به، وإن لم يحسن شيئًا آخر من القرآن من الأذكار بقدر ما يبلغ آيات الفاتحة، والشرط أن يأتي بسبعة أنواع من الذكر"[61].

ثم قال:" وهل يشترط أن تعادل كلمات الذكر كلمات الفاتحة بعد أن تنوع سبعة أنواع فوجهان: أحدهما: بلى. والثاني: لا. وإذا أتي بشيء آخر من القرآن، فالشرط أن يأتي بسبع آيات، فلو أتى بآية طويلة تعادل الفاتحة وتزيد عليها لم يجز، وهل يشترط أن تبلغ كلماتها كلمات الفاتحة، فعلى وجهين. فإن لم يحسن الذكر بالعربية قال رضي الله عنه: أتي به بالفارسية، ولا يأتي بالفارسية الفاتحة، لأن الواجب عليه الإتيان بالذكر إذا جهل الفاتحة، وما يقوم مقامه من القرآن، فإذا عجز عنه أتي بمعناه بالفارسية. وعند أبي يوسف، إن كان يحسن العربية لا تجزئه هذه الأذكار بالفارسية، وإن جهل العربية أجزأه.

وقال أبو حنيفة: سواء كان يحسن العربية، او لا يحسنها تجزيه هذه الأذكار بالفارسية، وكذلك الفاتحة يجوز عنده أن يقرأها بالفارسية. وزاد عليه فقال: لو قرأ آية من التوراة يوافق معناها معنى آية من القرآن جاز، وهذه المسألة تلقب بترجمة القرآن، وعندنا لا يجوز، وعنده يجوز. وكان القاضي أبو عاصم (رحمه الله)، يقول:

---

(61) التعليقة للقاضي حسين (على مختصر المزني) للقاضي أبو محمد (وأبو علي) الحسين بن محمد بن أحمد المَرْوَرُّوْذِيّ (ت: 462 هـ)، تحقيق: علي محمد معوض - عادل أحمد عبد الموجود: (2/ 723).





إنما يجوز ترجمة القرآن، إذا كان مثله في اللفظ والمعنى كقوله، خيرًا وشرًا، ويركب ويسجد، فأما إذا كان يخالفه في اللفظ والمعنى، فلا.

دليلنا: ما روي أن أعرابيًا جاء إلى رسول الله (صلى الله عليه وسلم) وقال: إني لا أحسن شيئًا من القرآن، فعلمني ما يجزئني في الصلاة، فقال (عليه السلام):" قل: سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم"[62].

2- قال الإمام النووي:" فرع: في مذاهب العلماء في التكبير بالعجمية: قد ذكرنا أن مذهبنا أنه لا تجوز تكبيرة الإحرام بالعجمية لمن يحسن العربية، وتجوز لمن لا يحسن، وبه قال مالك وأبو يوسف ومحمد وأحمد وداود والجمهور، وقال أبو حنيفة: تجوز الترجمة لمن يحسن العربية ولغيره، واحتج قوله بقول الله تعالى: **{وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّى}** [63]، ولم يفرِّق بين العربية وغيرها وبحديث: " تحريمها التكبير " وقياسا على إسلام الكافر، ودليلنا قوله (صلى الله عليه وسلم): " صلُّوا كما رأيتموني أصلي "[64].

---

(62) المصدر نفسه: (2/ 724ـ 725).

(63) (سورة الأعلى: 15).

(64) المجموع شرح المهذب للنووي: (3/ 301).





دیسان تەنانەت بانگ دانیش لە مەزهەبی پێشەوا ئەبو حەنیفەدا دروستە بە غەیری عەرەبی بێت، بەڵام لەلای جمهوری زانایان نابێت بە غەیری عەرەبی، تەنها لە دوو حاڵەتدا لای ئەوانیش لە مەزهەبی شافیعی خۆیشمانەوە دروستە:

**یەکەمیان:** ئەگەر نەیتوانی بە عەرەبی بیڵێت و تەنها بۆ خۆیشی بانگەکەی دا.

**دووەمیان:** ئەگەر بۆ خەڵکی بانگی دا بەڵام کەسیش نەبوو لە ناویاندا بتوانێت بە عەرەبی بانگ بدات.

ئەوا دروستە لەو دوو حاڵەتەدا بە کۆی ڕای زانیانی هەر چوار مەزهەب بە کوردی بانگ و قامەتیش بگوترێت.

قال شيخ الإسلام النووي: " قال صاحب الحاوي: لو أذن بالفارسية إن كان يؤذن لصلاة جماعة لم يجز، سواء كان يحسن العربية أم لا: لأن غيره قد يحسن، وإن كان أذانه لنفسه، فان كان يحسن العربية لم يجزئه كأذكار الصلاة، وإن كان لا يحسن أجزأه، وعليه أن يتعلم هذا كلامه، وهذا الذي قاله من أن مؤذن الجماعة لا يجزئه بالفارسية وإن لم يحسن العربية، محمول على ما إذا كان في الجماعة من يحسن العربية، فإن لم يكن(أي من يحسنها) صحَّ، وقد أشار إليه في تعليقه".

هەروەها لە مەزهەبی خۆشماندا وەک حەنەفیەکان دروستە لە نوێژیشدا کەسێک ئەگەر بە عەرەبی نەیدەزانی زیکرەکانی بکات بە غەیری عەرەبی ببیان کات و نوێژەکەشی دروستە، چونکە عوزری هەیە، وەک تەسبیحات و تەحییات شایەتومان





و سڵاواتەکان و تەنانەت بانگەکانیش لەکاتی کە نەزانێت بە عەرەبی بانگ بدات وەک گوتمان.

هەروەها دروستە قامەتکردنیش بە غەیری عەرەبی بە هەمان شێوەی خیلافی فیقهی لە بانگدا.

1- قال الإمام ابو الحسن الماوردي الشافعي في الحاوي الكبير:" فصل : قال الشافعي(رضي الله عنه) : " وعليه أن يتعلم " يعني : هذه الأذكار من التكبير وغيره إذا كان لا يحسنها بالعربية فذكرها بلسانه فعليه أن يتعلمها بالعربية ، فإن أمكنه أن يتعلمها بالعربية فلم يفعل وذكرها بلسانه لم يجزه وعليه الإعادة ، وإن لم يقدر على تعلمها إما لتعذر من يعلمه جازت صلاته إذا ذكرها بلسانه ثم فرض التعليم باق عليه إذا قدر "[65].

2- قال العلامة ابن قاسم في فتح القريب المجيب في شرح ألفاظ التقريب = القول المختار في شرح غاية الاختصار:" ومن عجز عن النطق بها (أي بتكبيرة الاحرام) بالعربية، ترجم عنها بأي لغة شاء"[66].

---

(65) الحاوى الكبير، أبو الحسن علي بن محمد بن محمد بن حبيب البصري البغدادي، الشهير بالماوردي (ت: 450هـ): (2 /220).

(66) فتح القريب المجيب في شرح ألفاظ التقريب = القول المختار في شرح غاية الاختصار (ويعرف بشرح ابن قاسم على متن أبي شجاع)، للإمام محمد بن قاسم بن محمد بن محمد، أبي عبد الله، شمس الدين الغزي، ويعرف بابن قاسم وبابن الغرابيلي (ت: 918هـ)، بعناية: بسام عبد الوهاب الجابي الجفان: (ص: 75).





**له عیبارەتی حەنەفیەکانیش لەم بارەوە بۆ زیاتر دڵنیایی:**

1ـ قال الإمام السرخسي في المبسوط: " ولو كبَّر بالفارسية جاز عند أبي حنيفة (رحمه الله)، بناء على أصله: أن المقصود هو الذكر، وذلك حاصل بكل لسان، ولا يجوز عند أبي يوسف ومحمد (رحمهما الله) إلا أن لا يحسن العربية، فأبو يوسف (رحمه الله تعالى) مرَّ على أصله في مراعاة المنصوص عليه، ومحمد فرَّق فقال: للعربية من الفضيلة ما ليس لغيرها من الألسنة، فإذا عبرَّ إلى لفظ آخر من العربية جاز، وإذا عبرَّ إلى الفارسية لا يجوز. وأصل هذه المسألة إذا قرأ في صلاته بالفارسية جاز عند أبي حنيفة (رحمه الله) ويكره، وعندهما لا يجوز إذا كان يحسن العربية، وإذا كان لا يحسنها يجوز، وعند الشافعي (رضي الله عنه) لا تجوز القراءة بالفارسية بحال، ولكنه إن كان لا يحسن العربية، وهو أمي يصلي بغير قراءة. وكذلك الخلاف فيما إذا تشهد بالفارسية أو خطب الإمام يوم الجمعة بالفارسية فالشافعي - رحمه الله - يقول إن الفارسية غير القرآن، قال الله تعالى: **{إنَّا جَعلناهُ قرآناً عَربيّا}**[67] وقال الله تعالى: **{وَلَوْ جعلناهُ قرآناً أعْجَميًّا}**[68] الآية.. فالواجب قراءة القرآن، فلا يتأدى بغيره بالفارسية، والفارسية من كلام الناس فتفسد الصلاة، وأبو يوسف ومحمد (رحمهما الله) قالا: القرآن معجز والإعجاز في النظم والمعنى فإذا قدر عليهما، فلا يتأدى الواجب إلا بهما، وإذا

---

(67) (سورة الزخرف: 3).

(68) (سورة فصلت: 44).





عجز عن النظم أتى بما قدر عليه كمن عجز عن الركوع والسجود يصلي بالإيماء، وأبو حنيفة (رحمه الله) استدل بما روي أن الفرس كتبوا إلى سلمان (رضي الله عنه) أن يكتب لهم الفاتحة بالفارسية فكانوا يقرءون ذلك في الصلاة حتى لانت ألسنتهم للعربية"[69].

2ـ قال الإمام أبو الحسن السغدي الحنفي في (النتف في الفتاوي) :" وروى عَنهُ حكم التَّكْبِير والاذان وَالْخطْبَة بالفارسيَّة.. وروى عَنهُ انه قال لو كبر بِالْفَارِسِيَّةِ جَازَ لَهُ، وذكر ابو يوسُف فِي الامالي عن ابي حنيفَة انه قَال: لَو اذن بِالْفَارِسِيَّةِ وأَقَام بالفَارِسِيَّةِ جَاز، وَذكر أَبو يُوسُف أَو خطب أَو تشهد بالفارِسِيَّةِ يجوز، ولو ذبح وسمى بالفارِسِيَّةِ جاز في قَوْله، وكذلكَ في قَول ابي عبد الله جَاز، هَذَا كُله بالفارسِيَّةِ، ولو قرأ بالفارسية، قال الشافعي: لا تجزيه، ولا تكون قراءة البتة، وفي قول أَبي يوسف ومحمد يجزيه وتجوز بها الصلاة اذا لم يحسن العربية، فإذا أحسن العربية فلا تجزيه، وفي قول أَبي عبد الله تجزيه على كل حال، ولا يستحب ذلك"[70].

---

(69) المبسوط، للإمام محمد بن أحمد شمس الأئمة السرخسي (ت 483هـ): (1/ 36ـ 37).

(70) النتف في الفتاوى، أبو الحسن علي بن الحسين بن محمد السُّغْدي الحنفي (ت:461هـ)، تحقيق: المحامي الدكتور صلاح الدين الناهي: (1/49ـ 51).





ئەوانەی کە نمونەمان پێ هێنانەوە هەمویان ناوی (الله) یان تێدا دەبرێت و زۆرێکیشیان لە نوێژشدان هەموشیان بەو شێوەی باسمانکردن دروستە واتای ناوەکەی الله تەرجەمەی زمانی فارسی بە نمونە بکرێت..

ئەوانەیش هەموو بەڵگەی حاشا هەڵنەگرە بۆ دروستی تەرجەمەی عەلەمی ناو و سیفەتەکانی خودا بۆ سەر زمانی تر.

هەروەها ئەرکانەکانی ووتاری هەینیش کە پڕیەتی لە ناوی (الله) لای پێشەوا (ابو حنیفة) بە جگە لە عەرەبی دروستە بگوترێن، بەڵام لای جمهوری زانایان پێنج روکنەکە دروست نییە بە غەیری عەرەبی، کە بریتین لە (الحمد، الصلاة، الوصیة، الآیة ، الدعاء) بەڵام وەعزو ئامۆژگاریەکانی نێو وتار دروستە بە غەیری عەرەبی.

لە بارەی دروستی پەرستنی خودا وە بە زمانی تر غەیری غەرەبی پێشەوای ئوسوڵی (الإمام السمرقندي الحنفي) لە کتێبی (عیون المسائل)یدا لە سەرباسی:" التعبُّد بالفارسية)دا دەفەرموێت: "ولو أن رجلاً أذَّن بالفارسية وهو يحسن العربية، أو خَطَبَ، أو تشهَّد، أجزأه في قول أبي حنيفة، ولا يجوز في قول أبي يوسف ومحمد"[71].

هەروەها (إقرار، هبة، وصية، طلاق، حلف، معاملات، إيلاء) یش کە سوێندی تێدایە، دروستە بە غەیری عەرەبی و دادەمەزرێت، تەنانەت نیکاحیش لای

(71) عيُون المسائل، أبو الليث نصر بن محمد بن أحمد بن إبراهيم السمرقندي (ت: 373هـ)، بتحقيق: د. صلاح الدِّين الناهي: (ص: 26).





حەنەفیەکان دروستە بە کوردی و لەلای ئیمامی غەزالی یش کە شافیعیە هەر دروستەو دادەمەزرێت بە زمانی غەیری عەرەبی وەک دەفەرموێت:" فرعٌ: الصّحيح أن ترجمتها (صيغة النكاح) بالفارسية وسائر اللغات يقوم مقامها، لأنها في معناها"[72].

تەنانەت نییەت هێنانی بۆ هیچ عیبادەتێک واجب نییە بە زمانی عەرەبی بێت، هیچ فەقیهێکیش نەیفەرمووە ئەگەر بە عەرەبی بهێنرێت خێری زیاترە.

چونکە نییەت هێنان لە ئەسڵ دا لە دڵدایە، بەڵام موستەحەببە بە زاریش بهێنرێت بۆ جەمعی خاتر و راگرتنی ئاگاهی دڵ، بەڵام واجب نییە، وەک هەندێک لە زانایان فەرمویانە واجبە وانییە. لە نمونەی دەقی شەرعیی لەو بارەوە:

١- قال الامام محيي الدين النووي في:" ومحلها (اي النية) القلب. ولا يشترط النطق بلا خلاف"[73].

2ـ قال الإمام فخر الاسلام أبو بكر القفال الشاشي الشافعي(ت: 507هـ) في حلية العلماء في معرفة مذاهب الفقهاء:" والنية فرض للصلاة، ومحلها القلب، وغلط بعض أصحابنا فقال لا تجزئه النية حتى يتلفظ بلسانه وليس بشيء"[74].

---

(72) الوسيط في المذهب، لحجة الإسلام أبو حامد محمد بن محمد الغزالي الطوسي (ت: 505هـ)، تحقيق: أحمد محمود إبراهيم , محمد محمد تامر:(5/ 46).

(73) روضة الطالبين وعمدة المفتين، للإمام محيي الدين النووي، بتحقيق: زهير الشاويش: (350/2).





ئەمانەی سەرەوە هەمووی بەڵگەی راست و دروست بوون لەسەر دروستی وەرگێڕانی لەفزی جەلالەو سیفەت و ناوە جوانەکانی بە هەموو زمانەکان لەوانیشدا بە کوردی.

لە جێیەک خیلاف هەبێت بۆ دروستی وەرگێڕانی واتای سورەتی فاتیحەو الله اکبر ی دامەزراندنی نوێژ و تەسبیحاتی ناو ناوێژ و شایەتومان و سڵاوات تێدا ،

هەروەها بانگدان بە کوردی و ئەرکانەکانی ووتاری هەینی و نیکاح و تەڵاق و سوێند خوارن..هتد..

ئیتر چ عەقڵێکی کورتەو چ بێ ئاگاییەکە لە شەریعەت کەسانێک لەفزی جەلالە بە غەیری (الله) بەکار نەهێنن لە گوتارو نوسین و ئامۆژگاریدا، یان بە دروستی نەزانن؟ خۆیشیان بە خوێنەوار بزانن، ئەوانە هیچ زانست و زانیارییەکیان نییە بە داخەوە لە دەقەکانی شەریعەت و رای جیاوازی فیقهی ئیسلامی.

خودا تەنها زمانی عەرەبی دروستنەکردووە، وە تەنها عەرەبیشی خەڵق نەکردووە، تا تەنها بەو زمانە دروست بێت موناجات و ستایش و پەرستنی زاتی حەق تەعالا.

بۆیە لە بەڵگەکانی عەزەمەتی خوداو سەلماندنی خودایەتی خودایە دروستکردنی بۆ ئەو هەموو زار و زاراوەو رەنگو نەتەوانە ، وەک دەفەرموێت: **{وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ**

---

(74) حلية العلماء في معرفة مذاهب الفقهاء، الإمام فخر الاسلام أبو بكر القفال الشاشي الشافعي(ت: 507هـ)، بتحقيق: د. ياسين أحمد إبراهيم درادكة: (2/ 70).





**خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْعَٰلِمِينَ}** [75].

هەروەها بوونی نەتەوەو زمانەکان لە ئیرادەو ویست و جەعلی ئیلاهییە، دەستکاریکردنی یان بەکەم سەیرکردنی هەر نەتەوەو زمانێک تانەو نارەزایە لە ویستی خودا و ئەوەیش بێگومان کوفرێکی راستەوخۆیە، چونکە خودا دەفەرموێت: **{ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ }** [76] .

هەروەها ئاشکرایە کە هەر نەتەوەیەک خودا بە زمانی ئەو نەتەوە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) و پەیامی خۆی ناردووە، وەک دەفەرموێت: **{ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ۖ.. }** [77] .

هەروەها فەرمویەتی بۆ هەموو قەوم و نەتەوەیەک پێغەمبەرێکمان ناردووە:

1ـ قال تعالى: **{إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٌ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ }** [78].

2ـ قال تعالى: **{ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۚ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ}** [79]

---

(75) (سورة الرّوم: ٢٢).

(76) (سورة الحُجُرات: ١٣).

(77) (سورة إبراهيم من الآية: ٤).

(78) (سورة الرّعد: ٧).

(79) (سورة فاطر: ٢).





له راڤەی ئایەتی چواری سورەتی ابراهیم بە تایبەت چەند دەقێکی زانایانی تەفسیرو فەرموودە بە زمانی عەرەبی نەقڵ دەکەین بۆ زیاتر دڵنیایی لەوانەیش:

1ـأخرج الحافظ ابن أبي حاتم الرازي الشافعي الأشعري في تفسيره المسند قال:" عن قتادة(رضي الله عنه) في قوله: **{وما أرسلنا من رسول إلا بلسان قومه}**، قال: بلغة قومه، إن كان عربيا فعربيا، وإن كان عجميا فعجميا، وإن كان سريانيا فسريانيا، ليبين لهم الذي أرسل الله إليهم، ليتخذ بذلك الحجة عليهم" [80].

2ـ قال الإمام أبو عبد الله القرطبي المالكي الأشعري في تفسيره الجامع لأحكام القرآن: " ( عربيا) أي أنزلناه بلسان العرب، لأن كل نبي أنزل كتابه بلسان قومه، قاله سفيان الثوري وغيره" [81].

3ـ قال الإمام ابن حيان محمد بن يوسف الأندلسي الأشعري في تفسيره:" وقال الضحاك : والضمير في **{قومه}** عائد على محمد (صلى الله عليه وسلم) قال: والكتب كلها نزلت بالعربية ، ثم أداها كل نبي بلغة قومه. قال الزمخشري : وليس بصحيح ، لأنّ قوله: **{ليُبيّن لهم}**، ضمير القوم وهم العرب ، فيؤدي إلى أنّ الله أنزل التوراة من السماء بالعربية ليبين للعرب ، وهذا معنى فاسد انتهى " [82].

---

(80) تفسير ابن أبي حاتم، بتحقيق عادل عبد الموجود وآخرين: (2234/7)برقم(12207).

(81) تفسير القرطبي: (16/ 61).

(82) البحر المحيط في التفسير بتحقيق عادل عبد الموجود وآخرين: (5/ 394).






4- قال الحافظ أبو الفداء ابن كثير الدمشقي الشافعي الأشعري في تفسيره:" هذا من لطفه تعالى بخلقه: أنه يرسل إليهم رسلا، منهم بلغاتهم ليفهموا عنهم ما يريدون وما أرسلوا به إليهم، كما قال الإمام أحمد: قال مجاهد: عن أبي ذر قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): "لم يبعث الله، (عز وجل)، نبيا إلا بلغة قومه"[83].

5- قال الحافظ عبد الرحمن ابن أبي بكر جلال الدين السيوطي الشافعي الأشعري في تفسيره:" وأخرج عبد بن حميد وابن جرير وابن المنذر وابن أبي حاتم عن قتادة - رضي الله عنه - في قوله: **{وما أرسلنا من رسول إلا بلسان قومه}** قال: بلغة قومه إن كان عربيا فعربيا وإن كان عجميا فعجميا وإن كان سريانيا فسريانيا ليبين لهم الذي أرسل الله إليهم ليتخذ بذلك الحجة علهم" [84].

بەڵام خودا(جل جلاله) تەنها قورئانی بە زمانی عەرەبی ناردووە، چونکە ئەوکات ئەو قەومە بە گشتی جاهیلترین و مێشکپوچترینی گەلانی دونیا بوون لە رووی شیرک و ستەم و بەد رەووشتیەوە.

---

(83) تفسير االقرآن العظيم لابن كثير بتحقيق: سامي سلامة: (4/ 477). والحديث أخرجه الإمام أحمد في المسند بتحقيق: السيد أبو المعاطي النوري بسند صحيح:(158/5) برقم (21739).

(84) الدر المنثور في التفسير بالمأثور للحافظ السيوطي: (5/ 4).





له رووی ئیمکانیشەوە جائیز بوو کە خودا قورئانیش بە زمانی عەجەمی نازڵ بکردایە، بەڵام ئەوکات بێباوەڕە عەرەبەکان شوێنی نەدەکەوتن و ئەو ئیعجازو گەردنکێشیەیش (تحدی) - کە مەبەست بوو لە قورئاندا کە بە عەرەبی بێت - رووی نەدەدا وەک قورئان دەفەرموێت: **{ وَلَوۡ جَعَلۡنَـٰهُ قُرۡءَانًا أَعۡجَمِيّا لَّقَالُواْ لَوۡلَا فُصِّلَتۡ ءَايَـٰتُهُۥٓۚ ءَا۬عۡجَمِيّ وَعَرَبِيّ قُلۡ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ هُدى وَشِفَآء..الآيج }**[85]

بەڵام گومان لەوەدا نییە کە دەعوەو بانگەوازەکەی حەزرەتی محمد (دروودی خودای لەسەر) - کە بریتییە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام - بۆ هەموو گەلانی دونیایە بە عەرەب و عەجەمەوە، هەروەها بۆ تێکڕای جنۆکەو ئادەمیزادیشە بە چەندین دەقی قورئان و سوننەت، پێشەوایانی تەفسیرو فەرمودە روونیان کردووەتەوە لەوانەیش:

1ـ قال الإمام فخر الدين الرازي في تفسيره:" والدليل على عموم الدعوة قوله تعالى: **{قل يا أيها الناس إني رسول الله إليكم جميعا}**[86] بل إلى الثقلين، لأن التحدي كما وقع مع الإنس فقد وقع مع الجن بدليل قوله تعالى: **{قل لئن اجتمعت الإنس والجن على أن يأتوا بمثل هذا القرآن لا يأتون بمثله ولو كان بعضهم لبعض ظهيرا}**[87] .." [88].

(85) (سورة فُصِّلَت من الآية: ٤٤).

(86) (سورة الأعراف: 158).

(87) (سورة الإسراء: 88)

(88) تفسير الرازي = مفاتيح الغيب أو التفسير الكبير (19/ 62) .






2ـ وقال الحافظ ابن كثير في تفسيره:" قال محمد بن كعب في قوله: **{وما أرسلناك إلا كافة للناس}** يعني: إلى الناس عامة. وقال قتادة في هذه الآية: أرسل الله محمدا (صلى الله عليه وسلم) إلى العرب والعجم، فأكرمهم على الله أطوعهم لله عز وجل". قال ابن أبي حاتم: حدثنا أبو عبد الله الظهراني، حدثنا حفص بن عمر العدني، حدثنا الحكم -يعني: ابن أبان عن عكرمة قال: سمعت ابن عباس يقول: إن الله فضَّل محمدا (صلى الله عليه وسلم) على أهل السماء وعلى الأنبياء. قالوا: يا بن عباس، فيم فضله الله على الأنبياء؟ قال: إن الله قال: **{وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ}**(89) ، وقال للنبي (صلى الله عليه وسلم): **{ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِلنَّاسِ }**(90) ، فأرسله الله إلى الجن والإنس. وهذا الذي قاله ابن عباس(رضي الله عنهما) قد ثبت في الصحيحين رفعه عن جابر قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): "أعطيت خمسا لم يعطهن أحد من الأنبياء قبلي: نصرت بالرعب مسيرة شهر. وجعلت لي الأرض مسجدا وطهورا، فأيما رجل من أمتي أدركته الصلاة فليصل. وأحلت لي الغنائم، ولم تحل لأحد قبلي. وأعطيت الشفاعة. وكان النبي يبعث إلى قومه، وبعثت إلى الناس عامة". وفي الصحيح أيضا أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال:

---

(89) (سورة إبراهيم من الآية: 4).

(90) (سورة سبأ من الآية: 28)





"بعثت إلى الأسود والأحمر": قال مجاهد. يعني: الجن والإنس. وقال غيره: يعني: العرب والعجم. والكل صحيح"[91].

له چەندین جێگەدا بە روونی ئەوەی فەرمووە کە قورئان بە زمانی عەرەبی نێردراوە لەوانە:

١- قوله تعالى: { فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَـٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلۡمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوۡما لُّدّا}[92]

2- فوله تعالى: { فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَـٰهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ }[93]

3- قوله تعالى: { نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ * عَلَىٰ قَلۡبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ * بِلِسَانٍ عَرَبِيّ مُّبِين}[94]

بۆیە دروستە گۆڕینی لەفزی جەلالە بە پێی زوبانەکان، لە زوبانی عیبری کە تەوراتی پێ نازڵ بووە یان عیبری کۆن یش کە ئینجیلی پێ نازڵ بووە یان زمانی سیریانی (بە پێی جیاوازی ڕاکان) لەفزی جەلالە وەک گوتمان بە (ئیل) هاتووە، وە لە قورئانیشدا دوبارەو سێبارە کراوەتەوە، وەک ئاماژەیەک بۆ خەڵکی عاقڵ کە دروستە بە تێکڕای زمانەکان ناوی خودا ببرێت.

---

(91) تفسير ابن كثير ت سلامة (6/ 518).

(92) (سُورَةُ مَريَمَ: ٩٧).

(93) (سُورَةُ الدُّخَانِ: ٥٨).

(94) (سُورَةُ الشُّعَرَاءِ: ١٩٣-١٩٥).





بە زمانی کوردیش بە ووشەی خودا هاتووە، ئەگەرچی دەقێک لەبەردەست نییە لە ئێستادا یان کتێبێکی ئاسمانی بۆ کورد بەڵام مەعلومە بە دەقی قورئان کە کوردیش وەک هەر نەتەوەیەک لە پێش ئیسلامدا پێغەمبەری هەبووە و ریسالەکەیشی بە هەمان زمانی ئەم نەتەوەیە بۆی رەوانە کراوە، وەک روونە لە ئایەتی چواری سورەتی ئیبراهیمدا: **{ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ }**[95] .

لە زمانی عەرەبیشدا بە لەفزی (الله) هاتووە، چونکە بەو زمانە قورئان هاتووەتە خوارەوە.

پێویسیشە بزانین کە نەتەوەی عەرەب پێش ئیسلام هەمان ووشەیان بۆ خودا بەکارهێناوە، چ لە ئاخاوتنیان وچ لە شیعر و نوسینیدا، بەتایبەت دەستەواژەی (باسمك اللهم)، هەروەها لە شیعری جاهیلیشدا هەر بەکار هاتووە، وەک شیعرەکەی لەبیدی کوڕی رەبیعە پێش ئیسلام بوونی کە گوتویەتی، وەک روونکراوەتەوە لە لایەن شێخی عەسقەلانی پێشەوا (شهاب ابو الفضل الدين احمد بن علي المصري الحافظ الشافعي الاشعري المتوفي ٨٥٢هـ)، لە (فتح الباري) [96] دا لە شەرحی حەدیسەکەی بوخاریدا کە هاتووە (عن أبي هريرة (رضي الله عنه) عن النبي (صلى

---

(95) (سُورَةُ إِبرَاهِيمَ: ٤).

(96) فتح الباري شرح صحيح البخاري، للحافظ العسقلاني الشافعي الأشعري: ( ٧/ ١٥٣).





الله عليه وسلم) قال: «أصدق كلمة قالها الشاعر، كلمة لبيد: ألا كل شيء ما خلا الله باطل، وكاد أمية بن أبي الصلت أن يسلم»)[97].

بەڵێ هەروەها ئایەتی: **{ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ}**[98] ئاماژەیەکی راستەوخۆیە کە لە سەرزاری کافراندا ووشەی (الله) هەبووە، بەڵام نەیاننناسیوە بەحق و نایانپەرستووە و هاوەڵیان بۆ بڕیارداوەو بە خوداو خالیق و رازیق و پەرستراوی بەهەقیان نەزانیوە. واتە نە تەوحیدی ربوبییەتیان هەبووە نە تەوحیدی ئولوهییەتیش، کە ئەوەیش بابەتێکی سەربەخۆیەو لە کتێبی (ئەحکامی بیدعەت و تەرک و قیاسدا لە روانگەی شەریعەتی ئیسلامەوە) بە درێژی و دەیان بەڵگەی قورئان و سوننەت رونمانکردووەتەوە ئەکرێت بگەڕێنەوە سەری[99].

کەواتە: هەر کەسێک مەنعی ستایش و ناوبردنی (خودا) بکات بە زمان و زاراوەو تەنانەت دیالیکتی تایبەتی خۆیشی ئەوا بەدڵنیایی وەستاوەتەوە لە دژی ئەو ئایەتە پیرۆزانەدا کە پێشتر باسمانکردن، خودا پەنامان بدات.

---

(97) صحيح البخاري – لجامع الصحيح المختصر، للإمام محمد بن إسماعيل أبي عبدالله البخاري الجعفي، بتحقيق د. مصطفى ديب البغا: (3/ 1395)برقم(3628).

(98) (سُورَةُ العَنكَبُوتِ: ٦١).

(99) ئەحکامی بیدعەت و قیاس و تەرک لە روانگەی شەریعەتی ئیسلامەوە، پ.د. حسن خالد مصطفى موفتي: ص 406-423.






تەنانەت وەک چۆن دروستە لە بری ناوی حەزرەتی (محمد) یان ووشەی (النبي) یان (الرسول)، بگوترێت: (پێغەمبەر ، پایامبەر، نێردراو)، چونکە بوونەتە عەلەم بۆ ناوی شەریفی ئەو زاتە، هەروەها دروستە بڵێیت (خودا)، چونکە ئەویش لە ناو کورداندا بووەتە عەلەم بۆ ناوی (الله) (جل شأنه).

وەک چۆن دروستە راڤەی قورئان بکەیت بە زمانی کوردی، هەروەهایش دروستە راڤەی فەرمودەکانی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بکەیت بە زمانی کوردی.

مەعلومیشە قورئان و سوننەت چەندە ناوی زاتی خوداو سیفەتەکانی تێدا براوەو هەموشیان دروستە بکرێنەوە بە کوردی بەو هەموە بەڵگەی کەباسمانکردن، وێڕای دەیان تەفسیری کوردی لە لایەن زانایانی کوردی پایە بەرزەوە..هەروەها تەفسیری فارسی و تورکی و ئینگلیزیش لە لایەن زانایانەوە..

سەرنج بدەن ووشەی (إلهي) بە یائی نیسبەت یان (یا إلهي)...یش لە موناجاتدا بە زۆری لە زمانی عەرەبیدا زانایانی ئیسلام بەکاریان هێناوە.. لە قورئانیشدا نەهاتووە و نەشم دیوە لە سوننەتی سەحیحیشدا هاتبێت..ئەگەر هاتبێتیش لە سوننەت یان لە هەندێ ئاساردا بەڵگەیە لەسەر دروستی بەکارهێنانی مەفهوم و واتای عەلەمی (الله) لە زمانی عەرەبیدا و لە غەیری عەرەبیشدا بە هاوواتای خۆی، چونکە مەفهومەکان هەر یەکێکن.. بۆیە کەسیش نەیگوتووە لە زانایان دروست نییە.

بەڵام لە سوننەتدا (یارب ، ربِّ، یارب جبریل، اللهمّ، یا حيّ یا قیوم، یاذا الجلال والإکرام..) هاتووە.






هەروەها لە قورئاندا (یارب) هاتووە وەک ئایەتەکانی: **{وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَذَا الْقُرْآنَ مَهْجُورًا}** [100] **{وَقِيلِهِ يَا رَبِّ إِنَّ هَؤُلَاءِ قَوْمٌ لَا يُؤْمِنُونَ}** [101]

کەواتە دەستەواژەکانی: (یا إلهي، یا معبودي ، یا رب، اللهم..هتد) ، ئەمانەو هاوشێوەکانی کە وەردەگێڕدرێنەوە سەر زمانی کوردی دەبێتە: خودایە، پەرستراوی من، پەروەردگارم.. بەکارهێنانی بەم شێوازانەیش وەک رونمانکردەوە هیچ کێشەیەکی شەرعیی تێدا نییە.

نابینن جگە لە ووشەی (الله) لە قورئاندا ووشەکانی (إله) و (لله) (اللهم)یش بەکار هاتووە وەک دەفەرموێت:

**{ وَإِلَـٰهُكُمۡ إِلَـٰه وَٰحِد لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحۡمَـٰنُ ٱلرَّحِيمُ}**[102]، **{ وَلِلَّهِ ٱلۡمَشۡرِقُ وَٱلۡمَغۡرِبُۚ فَأَيۡنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجۡهُ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيم }**[103]، **{ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَـٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ تُؤۡتِى ٱلۡمُلۡكَ مَن تَشَآءُ.. }**[104] .

هەروەها لە فەرمودە سەحیحەکانیشدا وەک گوتمان تێکڕایان هاتوون.

---

(100) (سورة الفرقان: 30).

(101) (سورة زخرف: 88:).

(102) (سورة البقرة ١٦٣).

(103) (سورة البقرة: ١١٥).

(104) (سورة آل عمران من الآية: ٢٦).





(اللهم) یش واته (یا الله) (یا) که لابراوه و به میمێک قەرەبووی بۆ کراوەتەوەو هیچ کێشەیەکیش بەرپا نەبووە..چونکە مەفهومی هەموویان هەر یەکێکە.. بەڵام لکاندنی ئەو میمە بە لەفزی جەلالەوە(اللهم) لە تایبەتمەندیەکانی ووشەی (الله) یە، وە هەرگیز پێکەوە (یا و میم) کۆنابنەوە، هەر وەک چۆن لە تایبەتمەندیەکانیەتی داخڵبوونی یائی بانگکردن لەکاتێکدا کە ئەلفولامی ناساندنیشی لەسەرە، وەک پێشەوا (جارالله الزمخشری) دەفەرموێت: " الميم في(اللهم ) عوض من يا، ولذلك لا يجتمعان، وهذا بعض خصائص هذا الاسم، كما اختص بالتاء في القسم، وبدخول حرف النداء عليه، وفيه لام التعريف، وبقطع همزته في يا ألله وبغير ذلك"(105).

به هەمان شێوەیش مەفهوم و مەفاد و واتاو مەبەستی (خودا) و (الله) یش هەر یەکە، هەروەها (رب) لەگەڵ (پەروەردگار) دا یەک واتا دەگەیێنن، بۆیە هەر یەکێکیان لە بری ئەوی تریان لە ئاخاوتندا بەکار بهێنرێت کێشەیەکی شەرعی تێدا نییە.

لەبەر هەمان بنەمایە دروستە بڵێیت: (عبد الإله) وەک چۆن دەڵێیت (عبدالله)، چونکە مەفادو مانای هەر وەک لە (الإله و الله) هەر یەکێکە.

بۆیە ئەمە قسەیەکی نا دروست وبێ بنەمای شەرعییە بگوترێت دروست نییە بڵێیت: (بەناوی خودای بەخشیندەی میهرەبان لە تەرجەمەو وەرگێڕانی (بسم الله

---

(105) الكشاف عن حقائق التنزيل وعيون الأقاويل في وجوه التأويل، أبو القاسم محمود بن عمر الزمخشري الخوارزمي، تحقيق: عبد الرزاق المهدي: (1/ 378).







الرحمن الرحیم) بە وەهمی لێکدانەوەی ئەوەی کە ووشەی (الله) عەلەمە بۆ خودا، بۆیە ئەوەی لە زمانی عەرەبیدا دروستە، بە هەمان شێوەیش لە زمانەکانی کوردی و فارسی و هیندی و پاکستانی و ئۆردوویی و چەندین زمانی تریش دروستە کە لە بری الله ووشەی (خودا) بەکارهاتووە لەوەتی خودا دروستی کردوون و لە پاش ئیسلامبوونیشیان.

چونکە (خودا) عەلەمە بۆ ناوی (الله) بە بێ جیاوازی.. هەروەک چۆن لە زمانی ئینگلیزیشدا: خودا واتە = God گاد ، خوایە: مای گاد: my god.

لە زمانی فارسیشدا: خُدا، واتە: خودا، هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ کوردی جگە لە شێوازی نوسین. مولانا جلال الدین ی بەلخی ڕۆمی لە موناجاتیدا لە دەفەرموێت:

اي خُدا إين وصل را هِجران مکُن * سرخوشانِ عشق را نالان مَکُن (106)

مامۆستا مەلا محمودی (بێخود)یش لە بەیتێکی موناجاتیدا دەفەرموێت:

ئەی (خودا) گەر مشتوماڵی لوتفی تۆ چاری نەکا

ئەیخووا وەک خۆرە ئاوێنـەی دڵم گەردی گونـاه(107)

---

(106) دیوان شمس، مولانا جلال الدین محمد بن محمد بهاء الدین بلخي رومی ت 670هـ ، غزل زماره (2022).

(107) دیوانی بێخود، مەلا محمودی بێخود، کۆکردنەوەی محمدی ملاکریم، چاپی یەکەم، بەغدا، لاپەڕە: ٢٣.






لە موناجاتێکی پێنج خشتەکیشیدا هەردوو ووشەی (خودا) و (الله) ی کۆکردووەتەوە، وەک دەفەرموێت:

ئەی (خودا)، ئەی رافیعی نۆ سەقفی گەردوون بێ عەمەد
نیعمەتت بۆ ئێمە (لا يُحصـــى)، صیفاتت (لا يُعـــــــدْ)
(شُكرُ للـــه) تا دەوامـــــی بێ لەگەڵ ڕۆحا جەســـــــەد
پڕ زمان و دڵمە یـــــــاڕەب (قُل هـــــوَ الله أحـــــد)
ذیـــکر و فیکری ظاهـــــیر و باطینمە (اللهُ الصـــمد)[108]

ئەگەر چاوێك بگێڕین بە دونیای دانراوەکانی عەللامەی زەمان زانای موفەسیر دانای کوردستان مامۆستا مەلا عبدالكريمی بیارە دا (المدرس) (رحمه الله) ئەو راستییامان زیاتر بۆ روون دەبێتەوە کە وەرگێڕانی زاراوەی عەرەبی (الله) بە هەمان واتای خۆی لە زاراوەی کوردیدا: (خودا) هیچ کێشەیەکی نییە لە ئاخاوتنەکاندا، بە نمونە مامۆستا لە کتێبی نووری قورئاندا دەفەرموێت:

بە ناوی بەرزی خالیقی عەللام* کە قورئانی کرد بە یاسای ئیسلام
ناوی پیرۆزی ئەو (خوداوەند)ە * دەرگای گوشادە بۆ تەوبەی بەندە[109]

هەروەها لە کتێبی نووری ئیسلامیدا دەفەرموێت:

کەوابێ، خالیـــق زیندوو زانـــــایە * لە سەر خواستی خۆی باش تەوانـــــایە

(108) دیوانی بێخود: لاپەڕە: 31.

(109) نووری قورئان، مامۆستا مەلا عبدالكريمی مدرس، ل: 3.





جیهان سەرانسەر لە شەهادەو غەیب * دروستکراوە بۆ (خودا)ی بیٚ عەیب[110]

هەروەها ئەگەر تەماشایەکی فەرهەنگە کوردییەکانیش بکەین سەرجەمیان کۆکن کە (خودا) بە جیاوازی لە سەرجەم لەهجە کوردییەکاندا هەر بە واتای دەقاودەقی (الله) هاتووە لە زمانی کوردیدا، ئەم راستیەش شاراوە نییە لە لای منداڵ و گەورەی کورد، بە نمونە:

١- واتای «خوا» لە فەرهەنگی خاڵدا: خوا: واتە: ئەو کەسەیە کە بووە و هەر دەبێ و خاوەن و دروستکەری هەموو جیهانە[111].

٢- واتای «خوا» لە هەنبانە بۆرینە دا: خوا: (کوردی) خودا، خودێ.(فارسی): خُدا: الله[112].

٣- واتای «خوا» لە فەرهەنگی وشەنامە: خوا: خودا[113].

---

(110) نووری ئیسلام ، مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدرس، ل: 9.

(111) فەرهەنگی خاڵ، شێخ محەممەد خاڵ ، زمان:کوردی بۆ کوردیی ناوەندی ساڵی بڵاوبوونەوە:٢٠٠٥.

(112) هەنبانە بۆرینە: مامۆستا هەژار، کوردی بۆ کوردیی ناوەندی و فارسی، ساڵی بڵاوبوونەوە:1990.

(113) فەرهەنگی وشەنامە: جەمال حەبیبوڵڵا فەرەج، زمان: کوردیی هەورامی بۆ کوردیی ناوەندی، ساڵی بڵاوبوونەوە:2010.






٤- واتای «خوا» لە فەرهەنگی شێخانیدا: خوا: خودا • خووا • خا • هۆرمیز • هۆما • خوڵا • یەزدان • خودێ • داوەر • خوداوەند • پەروەردگار • یەکتا • کارساز • خوەدا • خوەدێ • خوەدا • یەکتا[114].

٥- واتای خودا «xwa» لە فەرهەنگا کۆما کوردییا کورمانجی دا: xwa [115].

٦- واتای «Xuwa» لە فەرهەنگی وەهبی و ئەدمۆندزدا: Xuwa, Xuwaye ، ئەی خوایە : ya Xuwa, [116].

خۆ ئەگەر لە عەرەبیدا گوترا (إله) هەڵدەگرێت ووشەکە کە بۆ الله و جگە لەویش لە هەر پەرستراوێک، بەڵام کە گوترا الله تەنها بە پەرستراوی بەهەق دەگوترێت چونکە عەلەمە بۆ زاتی حەق تەعالا، بەهەمان شێوەیش لە زمانی کوردیدا ئەگەر گوترا (خودا) تەنها زیهنی کورد بۆ زاتی پەروەردگاری تاکی بێ هاوتای پەرستراوی بەهەق دەڕوات و جگە لەو هیچ پەرستراوێکی تر لە خۆ ناگرێت، چونکە خودا یش ناسراوەو عەلەمە بۆ زاتی الله جل جلاله.

---

(114) فەرهەنگی شێخانی، عەبدولوەهاب شێخانی، زمان:کوردی بۆ کوردیی ناوەندی، ساڵی بڵاوبوونەوە: 2009.

(115) فەرهەنگا کۆما کوردیی کورمانجی: کۆما کوردییا کورمانجی، زمان: کوردیی باکووری بۆ فارسی، ساڵی بڵاوبوونەوە:2012.

(116) فەرهەنگی وەهبی و ئەدمۆندز: تۆفیق وەهبی و ئەدمۆندز، زمان: کوردیی ناوەندی بۆ ئینگلیزی، ساڵی بڵاوبوونەوە:1966.





ئەوەی لە قورئاندا قەدەغەکراوە وەرگێڕانی ناوی الله یان سیفەتی الرحمن و الرحيم نییە بۆ سەر زمانی کوردی یان فارسی یان هەر زمانێکی تر، بەڵکو **ئەوەی حەرامەو دروست نییە بریتییە لە:**

**یەکەم:** ناوی کەسێک بنێت (الله) یان خودا.

**دووەم:** ئەنجامدانی لادان (إلحاد) لەناوەکانی خودا دا ، وەک دەفەرموێت:**{ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَـٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ }**[117] .

ئیلحادیش لە ناوە جوانەکانی خودادا بە چەند شێوازێک تەفسیر کراوە لەوانە:

1- لادان لە پەرستندا: لە بری خودا پەرستن شەیتان یان بوت یان هەواو نەفس یان گا بپرسترێت.

٢- لادان لە ناوبردنی خودادا بە نمونە لە بری (العزيز) بگوترێت (العُزَّى)، و لە بری (الله) بکوترت (اللات).

٣- لادان لە واتای ناوەکاندا و دابڕینی خودا لە سیفەتەکانی .

٤- شوبهاندنی خودا یان سیفەتەکانی بە سیفاتی دروستکراوەکانی، وەک بڕیاردانی دەست و قاچ و هەستان و دانیشن و دابەزین و جێگەو مەکان و زەمان و..هتد بۆ خودای پاک و بێگەرد لەو شوبهاندنانە، **{ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا**

---

(117) (سُورَةُ الأَعراف: ١٨٠).





**يَصِفُونَ**}[118]. چونکە وەک دەفەرموێت: { **لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ**}[119] .

**بڕوانە بۆ زیاتر ووردەکاری لە واتاکانی (ئیلحاد لە ناوەکانی خودا) دا لەم دەقانەی لای خوارەوە:**

1ـ قال الامام المفسر المحدث الصوفي ابو القاسم القشيري في تفسيره لطائف الإشارات:" الإلحاد هو الميل عن القصد، وذلك على وجهين بالزيادة والنقصان فأهل التمثيل زادوا فألحدوا، وأهل التعطيل نقصوا فألحدوا"[120].

2ـ قال الامام ابو الحسن الواحدي الشافعي في تفسيره الوجيز:" {**وذروا الذين يلحدون في أسمائه**} يميلون عن القصد وهم المشركون عدلوا بأسماء الله عمّا هي عليه فسمُّوا بها أوثانهم وزادوا فيها ونفصوا واشتقوا اللاَّت من الله والعُزَّى من العزيز ومناة من المنَّان"[121].

---

(118) (سُورَةُ الأَنعَامِ: ١٠٠)

(119) (سُورَةُ الشُّورَىٰ: ١١).

(120) لطائف الإشارات = تفسير القشيري، للامام عبد الكريم بن هوازن بن عبد الملك القشيري (ت: 465هـ)، بتحقيق: إبراهيم البسيوني: (1/ 591).

(121) الوجيز في تفسير الكتاب العزيز، أبو الحسن علي بن أحمد بن محمد بن علي الواحدي، النيسابوري، الشافعي (ت: 468هـ)، بتحقيق: صفوان عدنان داوودي: (ص: 423).





3ـ قال الإمام ابو محمد البغوي الشافعي في تفسيره:" قال يعقوب بن السكيت: الإلحاد هو العدول عن الحق، وإدخال ما ليس منه فيه، يقال: ألحد في الدين ولحد به. وقرأ حمزة: وذروا الذين يلحدون في أسمائه: هم المشركون عدلوا بأسماء الله تعالى عما هي عليه، فسموا بها أوثانهم فزادوا ونقصوا فاشتقوا اللات من الله والعزى من العزيز ومناة من المنان، هذا قول ابن عباس ومجاهد. وقيل: هو تسميتهم الأصنام آلهة"[122].

4ـ قال الإمام فخر الدين الرازي في تفسيره الكبير:" المسألة الثانية: قال المحققون: الإلحاد في أسماء الله يقع على ثلاثة أوجه:

الأول: إطلاق أسماء الله المقدسة الطاهرة على غير الله، مثل أن الكفار كانوا يسمون الأوثان بآلهة، ومن ذلك أنهم سموا أصناما لهم باللات والعزى والمناة، واشتقاق اللات من الإله، والعزى من العزيز، واشتقاق مناة من المنان. وكان مسيلمة الكذاب لقب نفسه بالرحمن.

والثاني: أن يسموا الله بما لا يجوز تسميته به، مثل تسمية من سماه- أبا- للمسيح. وقول جمهور النصارى: أب، وابن، وروح القدس، ومثل أن الكرامية يطلقون لفظ الجسم على الله سبحانه ويسمونه به، ومثل أن المعتزلة قد يقولون في أثناء كلامهم،

---

(122) معالم التنزيل في تفسير القرآن = تفسير البغوي، محيي السنة، أبو محمد الحسين بن مسعود بن محمد بن الفراء البغوي الشافعي (ت: 510هـ)، بتحقيق : عبد الرزاق المهدي: (2/ 253ـ 254).






لو فعل تعالى كذا وكذا لكان سفيها مستحقا للذم، وهذه الألفاظ مشعرة بسوء الأدب. قال أصحابنا: وليس كل ما صح معناه جاز إطلاقه باللفظ في حق الله، فإنه ثبت بالدليل أنه سبحانه هو الخالق لجميع الأجسام، ثم لا يجوز أن يقال: يا خالق الديدان والقرود والقردان، بل الواجب تنزيه الله عن مثل هذا الأذكار، وأن يقال: يا خالق الأرض والسموات يا مقيل العثرات يا راحم العبرات إلى غيرها من الأذكار الجميلة الشريفة.

والثالث: أن يذكر العبد ربه بلفظ لا يعرف معناه ولا يتصور مسماه، فإنه ربما كان مسماه أمرا غير لائق بجلال الله، فهذه الأقسام الثلاثة هي الإلحاد في الأسماء"[123].

5ـ قال الإمام القرطبي في تفسيره:" والإلحاد يكون بثلاثة أوجه:"أحدها : بالتغيير فيها كما فعله المشركون ، وذلك أنهم عدلوا بها عما هي عليه فسموا بها أوثانهم ؛ فاشتقوا اللات من الله ، والعزى من العزيز ، ومناة من المنان قاله ابن عباس وقتادة. الثاني : بالزيادة فيها. الثالث: بالنقصان منها"[124].

6ـ قال الامام الحافظ ابن كثير الدمشقي الشافعي الاشعري في تفسيره:"قال العوفي عن ابن عباس في قوله تعالى: **{وذروا الذين يلحدون في أسمائه}** قال: إلحاد الملحدين: أن دعوا (اللات) في أسماء الله. وقال ابن جريج، عن مجاهد: **{وذروا**

---

(123) مفاتيح الغيب أو التفسير الكبير: (15/ 415ـ 417).

(124) الجامع لأحكام القرآن للقرطبي بتحقيق: هشام سمير البخاري: (7/ 328).





**الذين يلحدون في أسمائه}** قال: اشتقوا "اللات" من الله، واشتقوا "العزى" من العزيز. وقال قتادة: **{يلحدون}** يشركون. وقال علي بن أبي طلحة، عن ابن عباس: الإلحاد: التكذيب"[125].

خۆ ئەگەر تێڕامان بکەین بۆ ئەو دەقانەی کە نەقڵمانکردن - هەروەها لە تەواوی ئەو دەقە تەفسیریانەی کە گەورە زانایانی تری تەفسیر لە زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت راڤەی ئایەتی لادانیان پێ کردووە (ئیلحاد لە ناوەکانی خودا) - بۆمان دەردەکەوێت کە هیچ زانایەک نەیگوتووە وەرگێڕانی ناوەکانی خودا بە لەفزی جەلالەیشەوە (الله) لادانی تێدایەو بەشێکە لەو ئیلحادەی کە ئایەتەکەی سەدوهەشتای سورەتی ئالی عیمران ئاماژەی بۆکردووە..!

ئەو گومانەی کە دروست بووە: گوایە نادروستە ووشەی (الله) بە ووشەی (خودا) بەکاربهێنرێت، یان وەرگێڕانی ناوەجوانەکانی یان سیفەتە بەرزەکانی بە زمانی کوردی یان هەر زمانێکی تر دروست نەبێت، بۆمان دەردەکەوێت کە هیچ بنەمایەی شەرعی و زانستی و زمانەوانی نییەو تەنها هەڵقولاوی نەزانیین و خۆ خراپ دەرخستنە.

(125) تفسير القرآن العظيم، أبو الفداء إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي البصري ثم الدمشقي (المتوفى: 774هـ)، تحقيق: سامي بن محمد سلامة: (3/515ـ516).







ماوەتەوە بۆ پاڵپشتی زیاتر ئەوەیش بڵێین کە قەناعەت نەکات بە فەتوای هەر چوار مەزهەبی ئیسلام لەو رووەو زیاتر پێی خۆش بێت رای مەلاکانی نەجدی سعودییەیش بزانێت دەڵێین:

بە راشکاوانە تەنانەت ئەوانیش بە جائیزیان زانیوە وەرگێڕانی ناوەکانی خودا و سیفەتەکانی بۆ سەر زمانەکانی تری وەک کوردی و فارسی و ئینگلیزی و..هتد، بە مەرجی شارەزایی لە هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی دا هەروەها کەسی وەرگێڕ متمانەدار و شەرع زان بێت، بە نمونە لە سەرباسی( حكم ترجمة اسماء الله الحسنى وحكم الحلف باسمه تعالى المترجم) لە پەیجی (الاسلام سؤال وجواب) المشرف العام الشيخ محمد صالح منجد:[126]

پرسیویانە لێی: (هل يجوز ترجمة أسماء الله وصفاته إلى لغة غير العربية , كما يقول الأنكليز ( God ) والأكراد يقولون ( خودي ) أي الله , وهل يجوز الحلف بهذه الأسماء باللغات التي ذكرت). لە وەڵامیدا دەڵێت: " الحمد لله. يشترط لجواز ترجمة معاني أسماء الله وصفاته بلغة غير العرب أمور : أن يكون القائم على الترجمة بصيراً باللغة العربية ، وبصيراً باللغة التي يريد الترجمة لها. أن يكون أميناً في نقله وترجمته.وأن يكون على علمٍ بالشريعة ، وأن يكون على اعتقاد أهل السنَّة والجماعة

(126) (الاسلام سؤال وجواب) المشرف العام الشيخ محمد صالح منجد: https://islamqa.info/ar/answers/171528 .






، وإلا فإنه لا يؤمن على ترجمته أن يدس بها اعتقادات ضالة منحرفة .وانظر فتاوى أهل العلم في بيان جواز ذلك بشروطه في جوابي السؤالين.

وفي سؤال المرقم: (9347): هل من التحريف في أسماء الله ترجمتها إلى لغة أخرى؟ الجواب: الحمد لله. تجوز ترجمة أسماء الله لمن لا يعرف اللغة العربية بلغتهم إذا كان المترجم بصيراً باللغتين كما يجوز أن تترجم لهم معاني الآيات القرآنية والأحاديث النبوية لتفهيمهم الدين. وبالله التوفيق وصلى الله على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم المصدر: فتاوى اللجنة الدائمة: 122/3.

وعند سؤال المرقم( ٩٨٥٥٣) :أنا من " بلغاريا " ، فهل يجوز لي عندما أقوم بترجمة أسماء الله سبحانه وتعالى ..الجواب: الحمد لله. أولاً: لا يوجد في الشرع ما يمنع المسلم من ترجمة معاني الآيات القرآنية والأحاديث النبوية ، لكن لا بدَّ من أن يكون القائم على الترجمة بصيراً باللغة العربية، وبصيراً باللغة التي يريد الترجمة لها، ولا بدَّ أن يكون أميناً في نقله وترجمته ، ولابدَّ أن يكون على علمٍ بالشريعة ، وأن يكون على اعتقاد أهل السنَّة والجماعة...وسئل الشيخ محمد بن صالح العثيمين (رحمه الله): هل يجوز ترجمة أسماء الله الحسنى إلى لغة غير عربية – يعني: أجنبية - ؟ فأجاب: ترجمة أسماء الله سبحانه وتعالى لمن يريد أن يتفهمها : هذا لا بأس به ، بل قد يكون واجباً ؛ إذ إن الذي لا يعرف اللغة العربية يحتاج إلى فهم المعنى ، ولهذا






قال الله (عز وجل): **( وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِ )** يعني: بِلُغتهم **(لِيُبَيِّنَ لَهُمْ)** [127] فترجمتها لأجل التفهيم : لا بأس به..الخ.[128].

ئەمەيش دەقی ئەو پرسيارەيە كە لە فتاوى اللجنة الدائمة كراوەو دەقی وەڵامەكەيشە كە بە دروستی زانيوە وەرگێڕانی ناوەكەنی خودا بۆ سەر هەر زمانێک بە مەرجی شارەزايی و بە قيياس لە سەر دروستی راڤەی قورئان و سوننەت بە مەبەستی تێگەياندن: تحت عنوان: (ترجمة أسماء الله) فتاوى اللجنة الدائمة:

**س:** أريد أن أقدم إليكم سؤالا قد اختلف العلماء فيه عندنا وهو مما علمنا من كتاب الله وسنة رسوله (صلى الله عليه وسلم) أن صفات الله تبارك وتعالى توقيفية فنثبت ما أثبتها الله تعالى وننفي ما نفى الله تعالى ونسكت عما سكت عنه الله تعالى إما في كتابه أو بلسان نبيه (صلى الله عليه وسلم) فهل يجوز أن يسمي الله أحد بغير اسمه مثل (خدا) بالفارسية، أو (خداي) بالبشتو، أو (كاد) بالإنجليزي وغيرها من الأسماء، وهل يكون من ذكر الله بغير اسمه الثابت في الكتاب والسنة ملحدا كما قال تبارك وتعالى: **{وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ}** أو لا؟ ومن العلماء من يقول يجوز هذه الأسماء ويستدلون بجبرائيل ويقولون (إيل) اسم لله بالعبرانية فإذا جاز بالعبرانية تغيير الاسم فيجوز أيضا بلغة أخرى، فهل يصلح هذا التأويل أم لا؟ وهل يجوز تغيير أسماء الله بلغة أخرى غير العربية أم لا؟ أفيدونا جزاكم الله خيرا.

---

(127)(سورةإبراهيم: من الآية 4).

(128) دروس الحرمين : دروس المسجد النبوي " الشريط 62 ، الوجه الثاني.







**ج:** تجوز ترجمة أسماء الله لمن لا يعرف اللغة العربية بلغتهم إذا كان المترجم بصيرا للغتين، كما يجوز أن تترجم لهم معاني الآيات القرآنية والأحاديث النبوية لتفهيمهم الدين. وبالله التوفيق. وصلى الله على نبينا محمد، وآله وصحبه وسلم.

اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء:

(عضو) ( عضو) (نائب رئيس اللجنة) (الرئيس)

عبد الله بن قعود، عبد الله بن غديا، عبد الرزاق عفيف، عبد العزيز بن باز[129].

(129) فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء، المجموعة الأولى (3/ 166ـ 167) رقم (8115).





# (کۆتایی توێژینەوە)

کورتەی کۆی قسەی پێویست لەو توێژینەوەیەدا ئەمەیە:

1- وەک چۆن دروستە و عیبادەتیشە ناوی(الله) ببریت و یاد و زیکری بە عەرەبی بکرێتەوە، هەروایش دروستەو عیبادەتیشە ناوی (خودا) بە کوردی ببرێت و یاد و زیکری بکرێت. هەروەها لە جیاتی ووشەی (الرب) بە عەرەبی، دروستە بە کوردی زاراوەی: (پەروەردگار) بەکاربهێنرێت.وە هیچ کێشەیەکی شەرعییان تیدا نییە بە کۆی رای زانایانی ئیسلام.

٣- بە هەمان شێوەیش تەواوی یاد و تەسبیحاتی خودا و پاڕانەوە لێی و شایەتومان سڵاواتدان و سەلامدانەوەی نوێژ دروستە بە زمانی کوردی ئەنجامی بدرێت لە دەرەوەی نوێژدا، ئەگەر کەسێکی کورد زمانیش عەرەبی نەدەزانی دروستە تەواوی ئەوانەی باسمانکرد بە زمانی خۆی لە ناوی نوێژیشدا ئەنجامیان بدات.

٤- بۆ ناو نوێژ و بانگیش ئەو جیاوازیەی زانایان هەبوو کە باسمانکردن (لە نیوان مەزهەبی أبو حنيفة و جمهوری زانایان) کە لە هەندێ حاڵەتدا هەموویان فەرمویانە بە زمانی غەیری عەرەبیش دروستە یادی خودا تیایدا بکرێت.

5- بۆمان دەرکەوت کە ئەو گومانەی لای هەندێك نیوە خوێنەوار دروست بووە: گوایە نادروستە ووشەی (الله) بە ووشەی (خودا) وەرگێڕانی بۆ بکرێت، بە هەمان شێوە ناوە جوانەکانیشی یان سیفەتە بەرزەکانی بۆ زمانی کوردی یان هەر





زمانێکی تر دروست نەبێت، وەرگێڕانیان بۆ بکرێت! هیچ بنەمایەکی شەرعی نییەو تەنها هەڵقولاوی نەزانینە.

6ـ بەکارهێنانی زاراوەی (خودا) بە کوردی لە جییاتی (الله)، پشتئەستورە بە کۆمەڵێک بەڵگەی دروستی شەرعی لەوانەیش: بەکارهێنانی قورئانی پیرۆزە بۆ ووشەی خودا بە زمانەکانی (عیبری، عیبرانی، سریانی)، لەوانەیش ووشەی (إیل)، لە جیاتی ووشەی (الله)ی زمانی عەرەبی، لە ناوەکانی وەک: (اسرائیل)و (جبرائیل) و..هتد. ئەمەیش بە کۆی رای زانایانی تەفسیر و زمانەوانی.

7- رای دروست ئەوەیە لە کاتی نوێژدا ئەگەر کەسێکی تازە موسڵمان، نەیدەتوانی بڵێت (الله أكبر) دروستە بە زمانی خۆی واتاکەی بڵێ، ئەگەر سورەتی فاتیحەی لەبەر نەبوو پێویستە بەو ئەندازەیە یادی خودا بکات بە زمانی عەرەبی، ئەگەر ئەوەیشی نەدەزانێ بە میقداری خۆیندنی فاتیحە با بوەستێت پاشان رکوع بەرێت، واجبیشە خۆی فێربکات.

7- تەنها لە دوو حاڵەتدا دروستە بانگدان بە غەیری عەرەبی: ئەگەر تەنها بانگەکە بۆ خۆی بدات و بانگی بە عەرەبی(ئیسلام)یش نەزانێت، یان بۆ کۆمەڵێک بانگ بدات و کەسیش لە ناویاندا شێوازە عەرەبیەکە نەزانن.





8- وەک چۆن ئەگەر سوێندی بە (الله) خوارد سوێندکەی دادەمەزرێت، هەروەهایش ئەگەر سوێندت بە ووشەی (خودا) خوارد سوێندکەی دادەمەزرێت و هیچ کێشەیەکی شەرعی تیدا نییە بە کۆی رای زانایانی ئیسلام.

ئەمانەو چەندین حوکم و بابەتی پێویستی تر کە لە توێژینەوەکەدا باسکراوە.. هیوادارین کە ئەم بابەتە گرنگە بە شێوەیەکی دروست و مانابەخش توانیبێتمان بیگەێنین بە موسڵمانانی کوردستان بە گشتی و تایبەتیش زانایانی بەڕێزی ئایینی پیرۆزی ئیسلام. والله من وراء القصد، وهو الهادي الى سواء السبيل، وصلى الله على سيدنا محمّد وعلى آله وصحبه وسلم أجمعين، وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين..

(بەندەی هەژار بۆ بەزەیی خودای پەروەردگار)

پ.د. حەسەن خالید موستەفا مەحمود موفتی

پرۆفیسۆر لە زانکۆی سەڵاحەددین، هەولێر، سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای فەتوا لە کوردستان

هەولێر/ کوردستان ٢٠ جومادای دووەم ١٤٤٤ هـ= ١٢ یەنایەر ٢٠٢٣م= ٢٢ بەفرانبار ٢٧٢٢ک





## (پێرستی سەرچاوەکان)

- **قورئانی پیرۆز.**

1) أثر القراءات القرآنية في الصناعة المعجمية تاج العروس نموذجا، د. عبدالرزاق القادوسي،جامعة حلون، ١٤٣١هـ.

2) الإشراف على نكت مسائل الخلاف، للقاضي أبو محمد عبد الوهاب بن علي بن نصر البغدادي المالكي (ت422هـ)، تحقيق: الحبيب بن طاهر، ط1، دار ابن حزم، 1420هـ - 1999م.

3) بيان تلبيس الجهمية في تأسيس بدعهم الكلامية، أبو العباس أحمد عبد الحليم بن تيمية الحراني، تحقيق : محمد بن عبد الرحمن بن قاسم، ط1، مطبعة الحكومة - مكة المكرمة، 1392هـ.

4) التعليقة للقاضي حسين (على مختصر المزني) للقاضي أبو محمد (وأبو علي) الحسين بن محمد بن أحمد المَرْوَرُّوْذِيّ (ت: 462 هـ)، تحقيق: علي محمد معوض - عادل أحمد عبد الموجود، : مكتبة نزار مصطفى الباز - مكة المكرمة.

5) تفسير الكشاف عن حقائق غوامض التنزيل، أبو القاسم محمود بن عمرو بن أحمد، الزمخشري جار الله (ت: 538هـ)، ط3: دار الكتاب العربي – بيروت،1407 هـ .

6) تفسير أسماء الله الحسنى، لأبي اسحاق ابراهيم بن السري الزجاج، تحقيق: احمد يوسف الدقاق، نشر دار الثقافة العربية.

7) تفسير البحر المحيط ، للإمام محمد بن يوسف الشهير بأبي حيان الأندلسي، تحقيق: الشيخ عادل أحمد عبد الموجود - الشيخ علي محمد معوض وآخرين، ط1: دار الكتب العلمية – لبنان، بيروت - 1422 هـ - 2001 م.






8) تفسير الجامع لأحكام القرآن، لأبي عبد الله محمد بن أحمد بن أبي بكر بن فرح الأنصاري الخزرجي شمس الدين القرطبي المالكي الأشعري(ت 671 هـ)، تحقيق: هشام سمير البخاري، دار عالم الكتب، الرياض، 1423 هـ = 2003م.

9) تفسير الرازي = مفاتيح الغيب = التفسير الكبير، لأبي عبد الله محمد بن عمر بن الحسن بن الحسين التيمي الرازي الملقب بفخر الدين الرازي ابن خطيب الري الشافعي الأشعري (ت: 606هـ)، (ط3: دار إحياء التراث العربي - بيروت- 1420 هـ.

10) تفسير القرآن العظيم، للحافظ أبي الفداء إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي البصري ثم الدمشقي الشافعي الأشعري (ت: 774هـ)، تحقيق: سامي بن محمد سلامة، ط2: دار طيبة، 1420هـ - 1999 م.

11) تفسير القرآن= تفسير العز بن عبد السلام، أبو محمد عز الدين عبد العزيز بن عبد السلام بن أبي القاسم بن الحسن السلمي الدمشقي، الملقب بسلطان العلماء، الشافعي الاشعري (ت:660هـ)، تحقيق: الدكتور عبد الله بن إبراهيم الوهبي، ط1، دار ابن حزم – بيروت، 1416هـ= 1996م.

12) تفسير المحرّر الوجيز في تفسير الكتاب العزيز، أبو محمد عبد الحق بن غالب بن عبد الرحمن بن تمام بن عطية الأندلسي المحاربي المالكي الأشعري (ت: 542هـ) تحقيق: عبد السلام عبد الشافي محمد، دار الكتب العلمية – بيروت، ط1 - 1422 هـ.

13) تفسير أنوار التنزيل وأسرار التأويل، ناصر الدين أبو سعيد عبد الله بن عمر بن محمد الشيرازي البيضاوي الشافعي الأشعري (ت 685هـ) تحقيق: محمد عبد الرحمن المرعشلي، ط1: دار إحياء التراث العربي – بيروت، 1418 هـ.

14) التوقيف على مهمات التعاريف، زين الدين محمد عبدالرؤف المناوي الشافعي الأشعري، تحقيق: محمد رضوان الداية، دار الفكر المعاصر، ١٤١٠هـ.

15) حاشية الجمل على شرح المنهج = فتوحات الوهاب بتوضيح شرح منهج الطلاب، (منهج الطلاب اختصره زكريا الأنصاري من منهاج الطالبين للنووي ثم شرحه في شرح منهج الطلاب) للشيخ سليمان الجمل الشافعي، دار الفكر، بيروت.






16) الحاوى الكبير، أبو الحسن علي بن محمد بن محمد بن حبيب البصري البغدادي، الشهير بالماوردي (ت: 450هـ)، دار الفكر ـ بيروت.

17) حلية العلماء في معرفة مذاهب الفقهاء، الإمام فخر الاسلام أبو بكر القفال الشاشي الشافعي(ت: 507هـ)، تحقيق: د. ياسين أحمد إبراهيم درادكة، ط1: مؤسسة الرسالة / دار الأرقم - بيروت / عمان، 1980م.

18) الدر المنثور في التفسير بالمأثور، للحافظ جلال الدين عبد الرحمن بن أبي بكر السيوطي الشافعي الأشعري(ت: 911هـ)،دار الفكر – بيروت ـ لبنان.

19) درء تعارض العقل والنقل، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم ابن تيمية الحراني الحنبلي الدمشقي (ت: 728هـ)، تحقيق: الدكتور محمد رشاد سالم، ط2: جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية، المملكة العربية السعودية، 1411 هـ - 1991م.

20) دروس الحرمين : دروس المسجد النبوي " الشريط 62 ، الوجه الثاني.

21) ديوان شمس، مولانا جلال الدين محمد بن محمد بهاء الدين بلخي رومى ت 670ه .

22) ديوانى بێخود، مەلا محمودى بێخود، كۆكردنەوەى محمدى ملاكريم، چاپى يەكەم، بەغدا، عيراق.

23) روضة الطالبين وعمدة المفتين، للإمام محيي الدين النووي، تحقيق: زهير الشاويش،ط3 ، المكتب الإسلامي، بيروت- دمشق- عمان، 1412هـ = 1991م.

24) الشرح الكبير على متن المقنع، للشيخ عبد الرحمن بن محمد بن أحمد بن قدامة المقدسي الجماعيلي الحنبلي، أبو الفرج،شمس الدين (المتوفى: 682هـ)، دار الكتاب العربي، بيروت.

25) شرح فتح القدير على الهداية، كمال الدين محمد بن عبد الواحد السيواسي ت681هـ، دار الفكر، بيروت ـ لبنان.

26) صحيح البخاري – الجامع الصحيح المختصر، للإمام محمد بن إسماعيل أبي عبدالله البخاري الجعفي، تحقيق د. مصطفى ديب البغا دار ابن كثير، اليمامة – بيروت، ط3، 1407 – 1987.





27) عيُون المسائل، أبو الليث نصر بن محمد بن أحمد بن إبراهيم السمرقندي (ت: 373هـ)، تحقيق: د. صلاح الدِّين الناهي، مطبعة أسعد، بَغْدَاد، 1386هـ.

28) الفتاوى الكبرى، أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني أبو العباس، تحقيق: حسنين محمد مخلوف، ط1: دار المعرفة، بيروت، 1386هـ.

29) فتح الباري شرح صحيح البخاري، للحافظ شهاب الدين أحمد العسقلاني الشافعي الأشعري، ط: دار المعرفة، بيروت، ١٣٧٩.

30) فتح القريب المجيب في شرح ألفاظ التقريب = القول المختار في شرح غاية الاختصار (ويعرف بشرح ابن قاسم على متن أبي شجاع)، للإمام محمد بن قاسم بن محمد بن محمد، أبو عبد الله، شمس الدين الغزي، ويعرف بابن قاسم وبابن الغرابيلي (ت: 918هـ)، بعناية: بسام عبد الوهاب الجابي، الجفان، ط1، دار ابن حزم، بيروت، 1425 هـ - 2005 م.

31) فەرهەنگا کۆما کوردیی کورمانجی: کۆما کوردییا کورمانجی، زمان: کوردیی باکووری بۆ فارسی، ساڵی بڵاوبوونەوە:2012.

32) فەرهەنگی خاڵ، شێخ محەممەد خاڵ ، زمان:کوردی بۆ کوردیی ناوەندی ساڵی بڵاوبوونەوە:٢٠٠٥.

33) فەرهەنگی شێخانی،: عەبدولوەهاب شێخانی، زمان:کوردی بۆ کوردیی ناوەندی، ساڵی بڵاوبوونەوە: 2009.

34) فەرهەنگی وشەنامە: جەمال حەبیبوڵڵا فەرەج، زمان: کوردیی هەورامی بۆ کوردیی ناوەندی، *ساڵی* بڵاوبوونەوە:2010.

35) فەرهەنگی وەهبی و ئەدمۆندز: تۆفیق وەهبی و ئەدمۆندز، زمان: کوردیی ناوەندی بۆ ئینگلیزی، ساڵی بڵاوبوونەوە:1966.

36) الكشاف عن حقائق التنزيل وعيون الأقاويل في وجوه التأويل،أبو القاسم محمود بن عمر الزمخشري الخوارزمي، تحقيق: عبد الرزاق المهدي، دار إحياء التراث العربي، بيروت.







37) گلستان، شيخى مصلح الدين سعدى شيرازي: چاپى تهران.

38) كيمياى سهعادت ، امام غزالي، تحقيق م. حسين خديوجم، چاپى ١٣٨٠.

39) اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء، المجموعة الأولى ، جمع وترتيب: أحمد بن عبد الرزاق الدويش، الناشر: رئاسة إدارة البحوث العلمية والإفتاء - الإدارة العامة للطبع – الرياض.

40) لسان العرب، أبو الفضل، جمال الدين محمد بن مكرم بن على، ابن منظور الأنصاري الرويفعى الإفريقى (ت: 711هـ)ط3: دار صادر - بيروت- 1414 هـ.

41) لطائف الإشارات = تفسير القشيري، للامام عبد الكريم بن هوازن بن عبد الملك القشيري (ت: 465هـ)، ط3، تحقيق: إبراهيم البسيوني، الهيئة المصرية العامة للكتاب – مصر.

42) المبسوط، للإمام محمد بن أحمد بن أبي سهل شمس الأئمة السرخسي (المتوفى: 483هـ)، دار المعرفة – بيروت، 1414هـ - 1993م.

43) المجموع شرح المهذب للشيرازي (مع تكملة السبكي والمطيعي) أبو زكريا محيي الدين يحيى بن شرف النووي الشافعي الأشعري(ت: 676هـ)، دار الفكر، بيروت.

44) المحلى بالآثار، أبو محمد علي بن أحمد بن سعيد بن حزم الأندلسي القرطبي الظاهري (ت: 456هـ)، دار الفكر – بيروت.

45) مسند أحمد بن حنبل، أبو عبد الله أحمد بن محمد بن حنبل بن هلال بن أسد الشيباني (ت: 241هـ)، تحقيق : السيد أبو المعاطي النوري، ط1 : عالم الكتب – بيروت، 1419هـ=1998 م.

46) معالم التنزيل في تفسير القرآن = تفسير البغوي، محيي السنة، أبو محمد الحسين بن مسعود بن محمد بن الفراء البغوي الشافعي (ت: 510هـ)، تحقيق : عبد الرزاق المهدي، ط1، دار إحياء التراث العربي –بيروت، 1420 هـ.

47) مغني المحتاج إلى معرفة معاني ألفاظ المنهاج، شمس الدين، محمد بن أحمد الخطيب الشربيني الشافعي (ت: 977هـ)ط1، دار الكتب العلمية، 1415هـ - 1994م.







48) المقصد الأنسى في شرح معاني أسماء الله الحسنى، للإمام الغزالي بتحقيق: بسام عبدالوهاب الجابي، ط١، قبرص، ١٤٠٧هـ.

49) موقع: الاسلام سؤال وجواب، المشرف العام الشيخ محمد صالح منجد: https://islamqa.info/ar/answers/171528 .

50) النتف في الفتاوى، أبو الحسن علي بن الحسين بن محمد السُّغْدي الحنفي (ت:461هـ)، تحقيق: المحامي الدكتور صلاح الدين الناهي، ط2، دار الفرقان، مؤسسة الرسالة - عمان ، بيروت ، 1404 – 1984.

51) الهداية في شرح بداية المبتدي، علي بن أبي بكر بن عبد الجليل الفرغاني المرغيناني، أبو الحسن برهان الدين (ت: 593هـ)، تحقيق: طلال يوسف، دار احياء التراث العربي - بيروت – لبنان.

52) هەنبانە بۆرینە: مامۆستا هەژار، کوردی بۆ کوردیی ناوەندی و فارسی، ساڵی بڵاوبوونەوە:1990.

53) الوجيز في تفسير الكتاب العزيز، أبو الحسن علي بن أحمد بن محمد بن علي الواحدي، النيسابوري، الشافعي (ت: 468هـ)، تحقيق: صفوان عدنان داوودي، ط1، دار القلم , الدار الشامية - دمشق، بيروت، 1415 هـ.

54) نووری قورئان، مامۆستا مەلا عبدالكريمی مدرس، چاپی یەکەم/ بەغدا، 1405 ك ـ 1985ز.

55) نووری ئیسلام ، مامۆستا مەلا عبدالكريمی مدرس، چاپخانەی (الحوادپ) بەغدا، 1988ز.

56) الوسيط في المذهب، لحجة الإسلام أبو حامد محمد بن محمد الغزالي الطوسي (ت: 505هـ)، تحقيق: أحمد محمود إبراهيم , محمد محمد تامر، ط1: دار السلام – القاهرة، 1417هـ.

57) ئەحکامی بیدعەت و قیاس و تەرک لە روانگەی شەریعەتی ئیسلامەوە)، پ.د. حسن خالد مصطفى موفتي، چاپی یەکەم، هەولێر،٢٠13م.


﴿وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعاً وَلاَ تَفَرَّقُواْ﴾
یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان
١٩٧٠/٩/٢١
ئەی ( خودا )، ئەی رافیعی نۆ سەقفی گەردوون بێ عەمەد
نیعمەتت بۆ ئێمە ( لا یُحصی )، صیفاتت ( لا یُعدْ )
( شُکرُ للە ) تا دەوامی بێ لەگەڵ روحا جەسەد
پڕ زمان و دڵمە یارەب ( قل هوَ اللە أحد )
ذیکرو فیکری ظاهیرو باطینمە ( اللە الصمد )
بێخود